سەنتەری زەهاوی بۆ لێکۆڵینەوەی فیکریی
پەیمانگای جیهانیی فیکری ئیسلامیی

# کۆنگرەی بەرگریی لە قورئان

## توێژینەوەکان ــ بەرگی یەکەم

- سرووش، سروشت و جۆرەکانی و بەرپەرچدانەوەی ئەو گومانانەی دەربارەی وروژێنراون
- گومانی ڕۆژهەڵاتناسان لەبارەی نووسینەوە و کۆکردنەوەی قورئانی پیرۆزەوە
- قورئانی پیرۆز.. چۆن بیخوێنینەوە و چۆن سەرنجی بدەین
- زانستەکانی قورئانی پیرۆز و مێژووییەتی دەق

کۆنگرەی بەرگریی لە قورئان
توێژینەوەکان ــ بەرگی یەکەم



سرووش، سروشت و جۆرەکانی و
بەرپەرچدانەوەی ئەو گومانانەی دەربارەی وروژێنراون
م. د. جەمیل عەلی رەسول سورچی



گومانی ڕۆژهەڵاتناسان لەبارەی
نووسینەوە و کۆکردنەوەی قورئانی پیرۆزەوە
پ.ی. د. ناراس موحەممەد سالح



قورئانی پیرۆز.. چۆن بیخوێنینەوە و چۆن سەرنجی بدەین
موحەممەد روشدی عوبێد



زانستەکانی قورئانی پیرۆز و مێژووییەتی دەق
موحەممەد موحەممەد حەمە میرزا




کۆنگرەی بەرگریی لە قورئان
توێژینەوەکان ــ بەرگی یەکەم

**سەنتەری زەهاوی بۆ لێکۆڵینەوەی فیکریی**
**پەیمانگای جیهانیی فیکری ئیسلامیی**

# کۆنگرەی بەرگریی لە قورئان

## توێژینەوەکان - کتێبی یەکەم

**ئامادەکردنی:**

**سەنتەری زەهاوی بۆ لێکۆڵینەوەی فیکریی**

**لیژنەی چاپ و بڵاوکردنەوە**

**چاپی یەکەم**

**١٤٣٤ ك** **٢٠١٣ ز**






ناوی کتێب: کۆنگرەی بەرگریی لە قورئان.

ئامادەکردنی: بەشی چاپ و بڵاوکردنەوە– سەنتەری زەهاوی بۆ لێکۆڵینەوەی فیکریی

لە بڵاوکراوەکانی: پەیمانگای جیهانیی فیکری ئیسلامیی و

سەنتەری زەهاوی بۆ لێکۆڵینەوەی فیکریی.

لە بەڕێوەبەرایەتیی گشتیی کتێبخانە گشتییەکان ژمارەی (      )ی ساڵی (٢٠١٣)ی دراوەتێ.

چاپی: یەکەم – سلێمانی – ٢٠١٣.

چاپخانە: شڤان.

تیراژ: (٥٠٠) دانە.

ئیمەیلی پەیمانگا: iiitkurdistan@yahoo.com

# ناوەڕۆک

## بە ناوی خوای بەخشندەی میهرەبان

## پێشەکی

قورئانی پیرۆز، وتەی خوای پەروەردگارە و لە رێگەی سرووشەوە، بە لەفز و واتا، بۆ دوایین پێغەمبەری خۆی کە موحەممەدە (دروودی خوای لەسەر بێت)، ناردوویەتیە خوارەوە. هەروەك ئەو قورئانە لە دوای هاتنەخوارەوەشی، بە شێوەی دەماودەم و پشتاوپشت، بە ئێمە گەشتووە، لە دوای ئێمەش، بۆ سەرجەم مسوڵمانان تا کۆتایی دونیا، هەر بەو شێوەیە دەگات، هەروەها کتێبێکی پارێزراویشە بە ویستی خوای گەورە، لە هەر شێواندن و دەستکارییکردنێك، هەتا کۆتایی دونیا.

ئەم قورئانە پیرۆزە بۆ ئێمەی مسوڵمان، بەڵکو بۆ سەرجەم مرۆڤایەتیش، رێنیشاندەر و هۆکاری سەرەکیی هیدایەتە، هەروەها سەرچاوەی زانین و مەعریفەی ئیسلامییە و بە هاتنەخوارەوەی، کێشە و گرفتەکانی شناسی مەعریفەی مرۆیی چارەسەر کرد، چونکە ئاشکراکەر و رۆشنکەری مانا و لایەنە شاراوەکانی تایبەت بە گەردوون و مرۆڤە، هەروەها وەڵامدەرەوەی سەرجەم ئەو پرسیارانەشە کە بیر و هزری مرۆڤ بۆ ئاشکراکردنی سونەنەکان ئامادەساز دەکات، هەروەك دەفەرموێت: (يُرِيدُ اللَّهُ لِيُبَيِّنَ لَكُمْ وَيَهْدِيَكُمْ سُنَنَ الَّذِينَ مِن قَبْلِكُمْ وَيَتُوبَ عَلَيْكُمْ وَاللَّهُ عَلِيمٌ حَكِيم) (النساء: ٢٦).

قورئانی پیرۆز، هار لە ساتەوەختی دابەزینی بۆ پێغەمبەری ئیسلام و بەگەڕخستنی لە ژیانی مسوڵماناندا، بەردەوام و بە هەموو شێوە و شێوازێك لە لایەن ناحەزانیەوە، چ ئەوانەی هەر لە بنەڕەتدا بێبڕوا بوون بە سەرجەم ئاینەکان، چ ئەوانەشی بەشێك بوون لە شوێنکەوتەکانی ئاینەکانی تر، هەوڵی

شێواندن و دوورخستنەوەی لە ژیانی مرۆڤەکان و بەگەڕخستنی لە سەرجەم کایەکاندا، دراوە. هەرچەندە هەموو هەوڵەکان و بە تێپەڕبوونی سەردەمە جیاوازەکان، لە بنەڕەتدا یەك ناوەرۆك و مەبەستیان هەبووە، بەڵام لە هەر سەردەمێك و ناوچەیەکی ئەم دنیایەدا، ئەو هەوڵانە بە فۆرمی جیا جیا خۆیان نمایش کردووە و زۆرجاریش خراونەتە چوارچێوەی توێژینەوەی زانستی و مەعریفییەوە.

هەر رەخنەیەك ئەمڕۆ ئاڕاستەی خودی قورئان و باس و چیرۆك و حوکمەکانی نێوی و شێوازی هاتنەخوارەوەی دەکرێت، لە سەردەمانی پێشووتردا زانایان و بیرمەندانی ئیسلام قسەیان لەبارەوە کردووە و وەڵامی راست و زانستییان داوەتەوە و لێکیان هەڵوەشاندوون. بە داخێکی زۆریشەوە، ئەمڕۆ لە هەرێمی کوردستان کە زۆرینەی زۆری دانیشتوانەکەی مسوڵمانن و ئاینی پیرۆزی ئیسلام کاریگەریی لەسەر کۆی ژیان و بیرکردنەوەیان هەیە، چەند هەوڵێکی رێکخراو بە ناوی ئازادیی رادەربڕین و توێژینەوەی زانستییەوە، بۆ تانەدان و رەخنەگرتنی بێبنەما لە قورئانی پیرۆز، تەنانەت بۆ بێڕێزییکردن بەرامبەری، هاتوونەتە ئاراوە، لەوپێناوەشدا چەندین دامودەزگای رەسمی و نارەسمی، ناوخۆیی و دەرەکی، خۆیان لە پشت ئەو هەوڵانەوە حەشارداوە و ئاگرەگەیان خۆش دەکەن.

هەربۆیە سەنتەری زەهاوی بۆ لێکۆڵینەوەی فیکریی، بە پێویستی زانی کە کۆنگرەیەکی زانستیی تایبەت بە قورئانی پیرۆز و ئیعجازەکانی و وەڵامدانەوەی ئەو رەخنە و سەرنجانەی ئاڕاستەی کراون و دەکرێن، ساز بکات. ئەوەبوو لە رۆژانی (٢٦-٢٧/موحەڕڕەم/١٤٣٣ی کۆچی) بەرامبەر بە (٢٢-٢٣/١٢/٢٠١١ی زاینی)، بە هاوکاریی پەیمانگای جیهانیی فیکری ئیسلامیی، یەکەمین کۆنگرەی زانستیی خۆی لە شاری سلێمانی بە ناونیشانی (کۆنگرەی بەرگریی لە قورئان)

و بە ئامادەبوونی دەیان کەسایەتیی فیکری و ئەکادیمی و زانای ئاینی و ڕۆشنبیر و زانستخواز لە هەرێمی کوردستان، عێراق، سعودیە، یەمەن و ئەردەن، ساز کرد.

لەو کۆنگرەیەدا و لە میانەی چوار دانیشتندا، چواردە توێژینەوە بە هەردوو زمانی کوردی و عەرەبی پێشکەش کران. شایانی باسیشە لە ئاهەنگی کردنەوەی کۆنگرەکەشدا، جگە لە وتاری بەخێرهێنان و کردنەوەی کۆنگرە کە لە لایەن هاوژین عومەرەوە پێشکەش کرا، وتاری لیژنەی ئامادەکاری کۆنگرە لە لایەن مامۆستا حسێن موحەممەد ئیبراهیم و وتاری سەنتەری زەهاوی لە لایەن دکتۆر سەباح بەرزنجی سەرۆکی سەنتەر و وتاری پەیمانگای جیهانیی فیکری ئیسلامیی لە لایەن دکتۆر رائید عوکاشە راوێژکاری زانستیی پەیمانگاوە پێشکەش کران. هەر لە ئاهەنگی کردنەوەی کۆنگرەکەدا، هەریەك لە بەڕێزان حاجی کامیل حاجی عەلی وەزیری ئەوقافی حکومەتی هەرێمی کوردستان و دکتۆر بەشیر خەلیل حەدداد سەرۆکی لیژنەی ئەوقافی پەرلەمانی کوردستان و دکتۆر مەحمود مەشهەدانی بە نوێنەرایەتیی دیوانی وەقفی سوننی عێراق و دکتۆر موحسین عەبدولحەمید بیرمەندی ئیسلامیی و دکتۆر موستەفا زەڵمی زانای دیاری کورد، وتەیان پێشکەش کرد.

هەروەها لە کۆتایی کۆنگرەکەشدا، ڕاگەیەنراوی کۆتایی کۆنگرەی بەرگریی لە قورئان کە کۆمەڵێك ڕاسپاردەی گرنگی بۆ کەسایەتی و دامودەزگا و لایەنە پەیوەندییدارەکان لەخۆ گرتبوو، لە لایەن دکتۆر حسێن موحەممەد سالحەوە پێشکەش کرا. دواتر و لە مەراسیمێکی شایستەدا خەڵاتی ڕێزلێنان بەسەر توێژەراندا دابەشکرا.

سەنتەری زەهاوی بۆ لێکۆڵینەوەی فیکریی، وەکو نەریتێکی زانستی و بە مەبەستی گشتاندنی کەڵك و سوودی توێژینەوەکانی کۆنگرەکە، بە پشتیوانیی

خوای پەروەردگار لە زنجیرەیەك کتێبدا سەرجەم توێژینەوەکان بە چاپ دەگەیەنێت. ئەمەی بەردەستیشتان کتێبی یەکەمی ئەو زنجیرەیەیە، کە چوار توێژینەوەی لەخۆ گرتووە. بە هیوای ئەوەی ببێتە مایەی پەخشکردنی زیاتری گەوهەر و مانا گرنگ و شاراوەکانی نێو قورئانی پیرۆز و هۆکارێکیش بێت بۆ کۆتاییهێنان، یان کەمکردنەوەی ئەو هێرش و رەخنە بێبنەما و نازانستییانەی سەبارەت بە قورئانی پیرۆز دەورووژێنرێن.

**هاوژین عومەر**

**ل. لیژنەی چاپ و بڵاوکردنەوە**

**سەنتەری زەهاوی بۆ لێکۆڵینەوەی فیکریی**

**٢٠١٣/٣/٥ی زاینیی**

**سلێمانی**

# سرووش، سروشت و جۆرەكانى و بەرپەرچدانەوەى ئەو گومانانەى دەربارەى وروژێنراون

م. د. جەميل عەلى رەسول سورچى

زانكۆى سەلاحەددين – هەولێر

كۆلێژى زانستە ئيسلامييەكان – بەشى بنەماكانى ئاين

وەرگێڕانى:

م. ى. ئەحمەد فاتح موحەممەد

## پوختەی توێژینەوە

ئەم توێژینەوەیە ئەوە دەسەلمێنێت کە نە پێغەمبەر ﷺ و نە هیچ کەسی تر لە سەردەمی ئەودا، دەستیان نەبووە لە دەقەکانی قورئاندا. ڕۆڵی پێغەمبەر ﷺ تەنها وەرگرتنی دەق و پاراستن و لێ تێگەیشتن و پاشان گەیاندن و ڕوونکردنەوە و ڕاڤەکردنی قورئانی پیرۆز بووە، لەگەڵ شوێنکەوتن و کارکردن بە ناوەڕۆکی. هەر گومانێك وروورژێنرابێت لە سەردەمی ئەو و پاش ئەودا توانای ئەو بەڵگە ژیری و زانستییانەی نییە کە پشتگیری لە بوونی سرووش دەکات.

## پێشەکی

سوپاس بۆ ئەو خودایەی کە کتێبی بۆ بەندەی خۆی دابەزاندووە و هیچ خوار و خێچییەکی تێدا نەکردووە، درود و سڵاو لەسەر باشترین دروستکراوی (محمد)، ئەو کەسەی قورئانی وەرگرتووە لەلایەن دانا و زانایەکەوە کە خودای گەورەیە، لەسەر هەموو کەس و یار و هاوەڵانی، دواتر:

بێگومان هەر پەیامێك پێویستی بە سرووشە، هیچ پەیامێکی ئاسمانی نەبووە سرووشی لەگەڵ نەبووبێت. پێغەمبەر ﷺ یەکەم نێدراو نەبووە، شێوەی ناردنی جیاواز نەبووە لە پێغەمبەرانی پێش خۆی، یەکەم پێغەمبەر نەبووە خەڵکی بە ناوی سرووشەوە بانگ بکات، وەك خوای گەورە دەفەرموێت: (إِنَّا أَوْحَيْنَا إِلَيْكَ كَمَا أَوْحَيْنَا إِلَى نُوحٍ وَالنَّبِيِّينَ مِن بَعْدِهِ وَأَوْحَيْنَا إِلَى إِبْرَاهِيمَ وَإِسْمَاعِيلَ وَإِسْحَاقَ وَيَعْقُوبَ وَالأَسْبَاطِ وَعِيسَى وَأَيُّوبَ وَيُونُسَ وَهَارُونَ وَسُلَيْمَانَ وَآتَيْنَا دَاوُودَ زَبُوراً) (النساء: ١٦٣). ئێمە سرووشمان بۆ تۆ ناردووە وەك چۆن بۆ نوح و پێغەمبەرانی پاش ئەومان ناردووە، سرووشمان بۆ ئیبراهیم و ئیسماعیل و ئیسحاق و یەعقوب و دوانزە برا و عیسا و یونس و هارون و سولەیمان ناردووە، زەبورمان داوە بە داوود. درودی خودا لەسەر هەموویان بێت، لەبەر ئەوە خودای گەورە بە خراپی زانیوە مرۆڤە ژیرەکان وا گومان بەرن کە سرووش بابەتێکی سەرسوڕهێنە، وەك

دەفەرموێت: (أَكَانَ لِلنَّاسِ عَجَباً أَنْ أَوْحَيْنَا إِلَى رَجُلٍ مِّنْهُمْ أَنْ أَنذِرِ النَّاسَ وَبَشِّرِ الَّذِينَ آمَنُواْ أَنَّ لَهُمْ قَدَمَ صِدْقٍ عِندَ رَبِّهِمْ قَالَ الْكَافِرُونَ إِنَّ هَـذَا لَسَاحِرٌ مُّبِينٌ) سورەتی یونس: ٢[١].

ئەو قورئانە پیرۆزەی دابەزیوەتە سەر پێغەمبەر ﷺ وتەی خوای گەورەیە. تەحەدای تێکڕای مرۆڤ و جنۆکەکانی پێکردووە هەتا ڕۆژی دوایی کە وێنەی ئەم قورئانە بێنن، یان وێنەی کورتترین سورەت لێی، دەستەوەستان ماون و هەرواش دەبن، وەك خوای گەورە دەفەرموێت: (وَإِن كُنتُمْ فِي رَيْبٍ مِّمَّا نَزَّلْنَا عَلَى عَبْدِنَا فَأْتُواْ بِسُورَةٍ مِّن مِّثْلِهِ وَادْعُواْ شُهَدَاءكُم مِّن دُونِ اللّهِ إِنْ كُنْتُمْ صَادِقِينَ)، واتە: ئەگەر لە گوماندا بن لەوەدا کە دامان بەزاندووە بۆ سەر بەندەی خۆمان، ئەوا سورەتێکی وەك ئەو بهێنن... (البقرة: ٢٣)، هەروەها دەفەرموێت: (قُل لَّئِنِ اجْتَمَعَتِ الإِنسُ وَالْجِنُّ عَلَى أَن يَأْتُواْ بِمِثْلِ هَذَا الْقُرْآنِ لاَ يَأْتُونَ بِمِثْلِهِ وَلَوْ كَانَ بَعْضُهُمْ لِبَعْضٍ ظَهِيرًا) (سورة الإسراء: ٨٨)، واتە: ئەی موحەممەد بڵێ ئەگەر مرۆڤ و جنۆکە کۆببنەوە کە وەك ئەم قورئانە بهێنن، ناتوانن وێنەی ئامادە بکەن، با هەندێکیان پاڵپشتی ئەوانی تریش بێت. هەروەها زانیاریی مێژووی تێدایە کە پێشتر باس نەکراوە و هەواڵی بە ڕووداوی داهاتوو داوە و بەو شێوەیە لە پاشاندا ڕوویداوە کە باسی کردووە، زانیاریی گەردوونی و پزیشکیی تێدایە کە ئێستا ڕاستییەکەی دەردەکەوێت، هەروەها بە پێچەوانەی تەورات و ئینجیلەوە بووە لە زۆر لەو زانیارییانەی کە باسیان کردووە، هەموو ئەمانە بەڵگەن کە قورئان وتەی خوای گەورەیە و هیچ مرۆڤێك دەستی نییە تێیدا، نە پێغەمبەر ﷺ نە کەسی تریش لە ڕاهیبەکان و کەسانی تر.

لەگەڵ ئەمەشدا هەندێك لە بێباوەڕە پراکماتیزییەکان، لەوانەی کە باوەڕیان بە پەنهان نییە، دەبینین هەوڵ دەدەن کە گومان بخەنە سەرچاوەی قورئانەوە بە

---

(١) بنوارە: مباحث في علوم القرآن، د. صبحي الصّالح: ٢٢-٢٣.

نکۆڵییان له سرووش، بۆئەوەی بتوانن ئاین و بیروباوەڕی ئاسمانی لەناوبەرن، لەو ڕێیەوە بگەن بە لەبنهێنانی ئاینەکان و گومڕاکردنی مرۆڤەکان، چونکە ئیمان پابەندە لەسەر باوەڕهێنان بە سرووش لەبەرئەوەی بنەمای ئاینەکانە، بۆیە جەختیان کردووەتە سەر سرووش بە گومان تێکردن لە ڕاستییەکانی. بۆ ئەو مەبەستەش پەنایان بردووەتە بەر ئەقڵانیەتی هاوچەرخ کە دەستی پراکماتیزمی و بێباوەڕی و بێسنووری پێگەیشتووە، هەتا وای لێهاتووە کە زۆرێك لە فێرخوازان کە بە ناتەواوی زانستیان وەرگرتووە، ڕاستیی سرووشیان پێ قبوڵ ناکرێ لەژێر کاریگەریی دوژمنانی ئیسلامدا، ئەمەیان ڕازاندووەتەوە بە ناوی زانست و ژیرییەوە.

جارێك دەڵێن: سرووش دروستکراوی پێغەمبەرە ﷺ و قسەی خۆیەتی، جارێك دەڵێن لە (بوحەیرا)ی ڕاهیبەوە وەریگرتووە، جارێك دەڵێن خۆی نووسیویەتی، پەتی ئەم گومانانە کورتە، بەرگەی زانست و ژیرییەکی دروست ناگرێت، وەك چۆن لەم توێژینەوەدا باسی لێ دەکەین.

بێباوەڕەکان ڕێڕەوی هاوبەش پەیداکەرە داماوەکانی ناو عەرەبیان گرتووەتەبەر لە بەستنەوەی کەسی پێدەر و کەسی وەرگر، بۆیە ڕاستییەکانیان تێکەڵ کردووە و سەریان لە خۆیان شێواندووە، بیروڕاکانیان دژ یەك کردووە. نەگەیشتونەتە ڕاڤەیەك کە تەنانەت عەقڵە نەخۆشەکانی خۆشیان پێی ڕازی بێت. وەك خوای گەورە ئەم سەرلێشێوانەیان لە تابلۆیەکی گاڵتە ئامێزدا باس دەکات: (بَلْ قَالُواْ أَضْغَاثُ أَحْلاَمٍ بَلِ افْتَرَاهُ بَلْ هُوَ شَاعِرٌ فَلْيَأْتِنَا بِآيَةٍ كَمَا أُرْسِلَ الأَوَّلُونَ). واتە: بێباوەڕان (دەربارەی سرووش) دەڵێن خەوی هەڵەج و بەڵەجە، نەخێر هەڵبەستراوە، نەخێر محەممەد ﷺ شاعیرە، ئەگەر نا با بەڵگەیەکمان بۆ بهێنێت وەك نێردراوانی پێشوو (الأنبياء: ٥).

## هۆكاری هەڵبژاردنی بابەتەكە

١- هەموو ئەمەی باسمان كرد، پاڵنەر بوون بۆ نووسین دەربارەی وەحی، بۆ ئەوەی پەردەی تاریكی لابدەین لەسەری و گومانە وروورژێنراوەكان هەڵبوەشێنینەوە. ڕوودانی سرووش دەسەلمێنێت لە ڕێگەی ئەو زانستەوە كە پشتگریی ئەگەری ڕوودانی دەكات، وەك خوای گەورە دەفەرموێت: (سَنُرِيهِمْ آيَاتِنَا فِي الْآفَاقِ وَفِي أَنفُسِهِمْ حَتَّى يَتَبَيَّنَ لَهُمْ أَنَّهُ الْحَقُّ أَوَلَمْ يَكْفِ بِرَبِّكَ أَنَّهُ عَلَى كُلِّ شَيْءٍ شَهِيدٌ) (فصلت: ٥٢)، واتە: بەڵگەكانیان پیشان دەدەین لە ئاسۆكانی ئاسماندا و لە خودی خۆیاندا، تا بۆیان دەردەكەوێت كە ئەمە هەقە، ئایا بەس نییە بۆ خودای تۆ كە ئاگادارە لە هەموو شتێك) (فصلت: ٥٣).

٢- لەبەرئەوەی ئەم بابەتە یەكێك بوو لە تەوەرەكانی ئەم كۆنگرەی سەنتەری (زەهاوی) بۆ توێژینەوەی هزری ڕێكی خستووە، بە هاوكاری لەگەڵ پەیمانگای جیهانیی هزری ئیسلامی، لەژێر ناوی (كۆنگرەی بەرگریی لە قورئانی پیرۆز)، هەروەها توێژەر حەزی كرد لەم كۆنگرەیەدا بەشداری بكات، بۆ ئەوەی شكۆمەند بێت بە خزمەتكردنی قورئانی پیرۆز.

## پلانی توێژینەوە

ئەم توێژینەوەیە پێكدێت لە پێشەكییەك و چوار باس و كۆتاییەك، لە پێشەكییەكەدا باسم لە گرینگیی بابەتەكە و ئەو هۆكارانەی هانیاندام ئەم بابەتە هەڵبژێرم و پلانی توێژینەوەكە، كردووە.

لە باسی یەكەمدا پێناسەی سرووشم كردووە لە زمان و زاراوەدا و سروشتی و چۆنیەتیی، لە سێ داواكراودا.

لە باسی دووەمدا جۆرەكانی سرووش و شێوازەكانی دابەزینی جوبرەئیل ﷵ بۆ سەر پێغەمبەر ﷺ و حاڵی پێغەمبەر ﷺ لە كاتی وەرگرتنی سرووشدا، ئەمەش لە سێ داواكراودا.

باسی سێیەم دەربارەی بەڵگە زانستی و ژیرییەکانە لەسەر ئەگەری بوونی سرووش، لە دوو داواکراودا.

باسی چوارەم دەربارەی ئەو گومانانەی ورووژێنراون دەربارەی سرووش و بەرپەرچدانەوەیان ئەمەش لە چوار داواکراودا.

لە کۆتاییدا داواکارم لە خوای گەورە کە یارمەتیدەرم بێت بۆ ئەوەی پێی خۆشە و رەزامەندیی هەیە لەسەری، درود و سڵاو بۆ گیانی پاکی پێغەمبەر و گشت یارانی.

# باسی یەکەم:
# پێناسە و سروشتی سرووش

وا باشە پێش ئەوەی بچینە ناو قووڵایی بابەتەکەوە، پێناسەیەکی سرووش بکەین لە زمان و زاراوەدا و پەیوەندیی نێوانیان روونبکەینەوە.

## داواکراوی یەکەم: پێناسەی سرووش لە زماندا

وشەی سرووش (الوحي): وشەیەکی عەرەبیی رەسەنە، لە عەرەبیدا بە واتای خێرایی، هێمایەکی خێرا دێت[٢].

١- هێمایەکی خێرا وەك ئاماژەپێکردن، وەك خوای گەورە دەربارەی زەکەریا ﷺ دەفەرموێت: (فَخَرَجَ عَلَى قَوْمِهِ مِنَ الْمِحْرَابِ فَأَوْحَى إِلَيْهِمْ أَن سَبِّحُوا بُكْرَةً وَعَشِيًّا) (مريم: ١١)، واتە: لە خەڵوەتگەکەی دەرچوو بەرەو کەسوکاری هێمایەکی خێرای بۆ کردن و هیچ قسەی نەکرد[٣] کە لە بەیانیان و خەوتناندا یادی خوا بکەن.

٢- نامە: دەوترێ: (أوحى الرجل) ئەگەر بە پەیامبەرێکی متمانەداردا نامەیەك یان پەیامێك بنێرێت بۆ یەکێك لە بەندە متمانەدارەکانی[٤].

٣- (إلهام) خستنە دڵ: وەك خوای گەورە دەفەرموێت: (وَأَوْحَيْنَا إِلَى أُمِّ مُوسَى أَنْ أَرْضِعِيهِ) (القصص: ٧)، واتە: خستمانە دڵی دایکی موساوە کە موسا بەخێو بکات. هەروەها دەفەرموێت: (وَإِذْ أَوْحَيْتُ إِلَى الْحَوَارِيِّينَ أَنْ آمِنُواْ بِي وَبِرَسُولِي قَالُوَاْ آمَنَّا وَاشْهَدْ بِأَنَّنَا مُسْلِمُونَ) (المائدة: ١١١)، واتە: خستمە دڵی

---

(٢) بنوارە: المحكم والمحيط الأعظم: ٣٨/٤، وتاج العروس: ١٧٢/٤٠، والوحي ودلالاته في القرآن الكريم والفكر الإسلامي: ٩.

(٣) بنوارە: تفسير الطّبري: ٥٣/١٦، وتفسير الصّنعاني: ٤/٣، وتفسير أبي السّعود: ٢٥٨/٥.

(٤) بنوارە: لسان العرب: ٣٧٩/١٥، مادة –وحي-.

حەوارییەکانەوە کە بڕوا بهێنن بە من و بە پێغەمبەرانم، وتیان: بڕوامان هێنا و شاهێد بە کە ئێمە موسڵمانین. هەندێك لە زانایان دەفەرمون: خستیە دڵیانەوە[٥].

خستنە دڵی ئاژەڵانیش دەگرێتەوە، وەك خوای گەورە دەفەرموێت: (وَأَوْحَى رَبُّكَ إِلَى النَّحْلِ أَنِ اتَّخِذِي مِنَ الْجِبَالِ بُيُوتًا وَمِنَ الشَّجَرِ وَمِمَّا يَعْرِشُونَ) (النحل: ٦٨)، واتە: خستییە دڵی هەنگەوە کە لە شاخەکان و لە دارەکان خانوو بۆ خۆت دروست بکە[٦].

٤- قسە بە دەنگی نزم: واتە بدوێیت بۆ یەکێك و بیشاریتەوە لە کەسانی تر، بۆیە ناونراوە سرووش (الوحي)، چونکە ئەو پەرییە سرووش دەشارێتەوە لە کەسانی تر و تەنها پێغەمبەر ﷺ ئاگای لێی دەبێت.

٥- هەروەها خوای گەورە دڵەڕاوکێی شەیتان و رازاندنەوەی ویستەکانی بە مرۆڤ، بە (وحي)[٧] ناوبردووە. وەك دەفەرموێت: (وَكَذَلِكَ جَعَلْنَا لِكُلِّ نِبِيٍّ عَدُوًّا شَيَاطِينَ الإِنسِ وَالْجِنِّ يُوحِي بَعْضُهُمْ إِلَى بَعْضٍ زُخْرُفَ الْقَوْلِ غُرُورًا) (الأنعام: ١١٢)، واتە: بەو شێوەیە بۆ هەموو پێغەمبەرێك دوژمنمان دروستکردووە لە شەیتانەکانی ناو مرۆڤ و جنۆکە، هەندێکیان سرووش بۆ هەندێکی تریان دەکەن...

دەفەرموێت: (وَإِنَّ الشَّيَاطِينَ لَيُوحُونَ إِلَى أَوْلِيَآئِهِمْ لِيُجَادِلُوكُمْ) (الأنعام: ١٢١)، واتە: بە راستی شەیتانەکان سرووش بۆ دۆستانیان دەکەن لە مرۆڤ، بۆ ئەوەی

---

(٥) بنوارە: تفسير النّسفي: ٣٠٨/١، وتفسير السّمرقندي: ٤٥٠/١، والكشّاف: ٧٢٣/١، وتفسير البيضاوي: ٣٧٩/٢.

(٦) بنوارە: مباحث في علوم القرآن، منّاع القطّان: ٢٣.

(٧) بنوارە: تفسير النّسفي: ٣٤١/١، وتفسير السّمرقندي: ٤٩٤/١، وتفسير البيضاوي: ٤٤٣/٢، وتفسير البغوي: ١٢٤/٢.

چەلەحانێتان لەگەڵدا بکەن، واتە وەسوەسە دەخەنە دڵیانەوە بۆ ئەوەی قسەی پڕوپووچیان پێ بکەن[٨].

٦- فەرمان[٩] (الأمر): وەك خوای گەورە دەفەرموێت: (وَإِذْ أَوْحَيْتُ إِلَى الْحَوَارِيِّينَ أَنْ آمِنُواْ بِي وَبِرَسُولِي) (المائدة: ١١١)، واتە: فەرمانم کرد بە حەوارییەکان کە بڕوا بە من و پێغەمبەرانم بێنن وەك هەندێك زانایان فەرموویانە، دەفەرموێت: (بِأَنَّ رَبَّكَ أَوْحَى لَهَا) (الزلزلة: ٥)، واتە: بەوەی کە خوای گەورە فەرمانی پێکردووە.

٧- نووسین و نووسراو و پەرتووك[١٠].

ئەبو ئیسحاق دەڵێت: "سرووش لە زماندا گەیاندنێکە بە پەنهان، بۆیە خستنە دڵ پێی دەوترێت سرووش"[١١].

ئەزهەری دەڵێت: "هەورەها بە هێما و ئاماژە دەوترێت سرووش... هەموو ئەمانە گەیاندنن، با هۆکار و قسە لەسەریان جیاواز بێت"[١٢].

لەمەوە بۆمان دەردەکەوێت کە ئەم واتایانە هەموویان بە دەوری هەواڵێکی پەنهانی خێرادا دەسوڕێنەوە، بۆیە بە هێمای خێرا و ئاماژە و خستنە دڵەوە دەوترێت سرووش[١٣].

---

(٨) بنوارە: تفسير السّمرقندي: ٤٩٧/١، وتفسير النّسفي: ٣٤٣/١، وتفسير البيضاوي: ٤٤٨/٢، وتفسير الجلالين: ١٨٣.

(٩) بنوارە: الكشّاف: ٧٢٣/١، وتفسير البيضاوي: ٣٧٩/٢، وتفسير الجلالين: ١٦٠.

(١٠) بنوارە: لسان العرب: ٣٧٩/١٥، مادة –وحي–.

(١١) بنوارە: تاج العروس: ١٧١/٤٠.

(١٢) بنوارە: تاج العروس: ١٧٢/٤٠.

(١٣) بنوارە: العقيدة الإسلاميّة ومذاهبها: ٤٨٠.

## داواكراوی دووەم: پێناسەی سرووش لە زاراوەدا

سرووش ئەوەیە کە خوای گەورە هەرچیی بوێت لە شێوەکانی زانست، بیگەنێت بە هەڵبژێردراوانی خۆی، بەڵام بە شێوەی پەنهان و جیاواز لە عادەتی[١٤].

وەك خوای گەورە دەفەرموێت: (وَكَذَلِكَ أَوْحَيْنَا إِلَيْكَ رُوحاً مِّنْ أَمْرِنَا مَا كُنتَ تَدْرِي مَا الْكِتَابُ وَلَا الْإِيمَانُ وَلَكِن جَعَلْنَاهُ نُوراً نَّهْدِي بِهِ مَنْ نَّشَاء مِنْ عِبَادِنَا وَإِنَّكَ لَتَهْدِي إِلَى صِرَاطٍ مُّسْتَقِيمٍ) (الشورى: ٥٢)، واتە: بەو شێوەیە سرووشی رۆحێکمان بۆ تۆ کردووە...

لەو پێناسەیەوە دەردەکەوێت کە سرووش هەوڵدانێکە لە خوای گەورەوە و پێغەمبەرەکەی ئەم زانستە خودابیە وەردەگرێت، لە کاتێکدا کە بە تەواوی بە هۆش و ئاگایە دەربارەی ئەوەی کە پێی دەدرێت، بە بێ ئەوەی کە خۆی سەرپشك بێ و دەسەڵاتی هەبێت لەوەدا کە پێی دەدرێت و دەستی هەبێت لە دەقەکەیدا، ئەگەر ئەو سرووشەی پێی دەدرێت دەق بێت. وەك خوای گەورە دەفەرموێت: (وَمَا يَنطِقُ عَنِ الْهَوَى) (النجم: ٣)، واتە: لە خۆیەوە هیچ دەرنابڕێت، هەروەها دەفەرموێت: (وَإِذَا تُتْلَى عَلَيْهِمْ آيَاتُنَا بَيِّنَاتٍ قَالَ الَّذِينَ لاَ يَرْجُونَ لِقَاءنَا ائْتِ بِقُرْآنٍ غَيْرِ هَـذَا أَوْ بَدِّلْهُ قُلْ مَا يَكُونُ لِي أَنْ أُبَدِّلَهُ مِن تِلْقَاء نَفْسِي إِنْ أَتَّبِعُ إِلاَّ مَا يُوحَى إِلَيَّ إِنِّي أَخَافُ إِنْ عَصَيْتُ رَبِّي عَذَابَ يَوْمٍ عَظِيمٍ) (يونس: ١٥)، واتە: ئەگەر ئایەتەکانمان بە روون و ئاشکرایی بخوێندرێتەوە بۆیان، ئەوانەی چاوەڕێی گەیشتن نین پێمان دەڵێن قورئانێکی تر بهێنە بێجگە لەمە، یان ئەمە بگۆڕە، ئەی موحەممەد بڵێ: بۆ من نییە کە لە خۆمەوە بیگۆڕم، تەنها شوێن ئەوە دەکەوم کە سرووش دەکەن بۆم، من لە سزای رۆژێکی گەورە دەترسم ئەگەر لە پەروەردگارم

(١٤) بنوارە: العقيدة الإسلاميّة ومذاهبها: ٤٨٠، ومناهل العرفان في علوم القرآن: ٤١، ومحاضرات في علوم القرآن: ٤٢، ووحي الله: ٩٨.

یاخی ببم. ئەوەی کە سرووش دەکرێت بۆ پێغەمبەر ﷺ بێگومان ئەو دەقە تەواوە گومان هەڵنەگرەیە وەك ئەوەی راستەوخۆ لە خوداوە وەرگیرابێت، وەك دەفەرموێت: (فَإِن كُنتَ فِي شَكٍّ مِّمَّا أنزَلْنَا إِلَيْكَ فَاسْأَلِ الَّذِينَ يَقْرَؤُونَ الْكِتَابَ مِن قَبْلِكَ لَقَدْ جَاءكَ الْحَقُّ مِن رَّبِّكَ فَلاَ تَكُونَنَّ مِنَ الْمُمْتَرِينَ) (يونس: ٩٤)[١٥]، واتە: ئەی موحەممەد ئەگەر گومانێکت هەیە دەربارەی ئەوەی دامانبەزاندووە بۆت، ئەوا پرسیار لەمانە بکە کە پێش تۆ کتێب دەخوێننەوە، بە راستی، راستی و رەوا لە پەروەردگارتەوە هاتووە بۆت، تۆش مەچۆرە ریزی گوماندارانەوە.

واتای زاراوەیی سرووش هەردوو واتا زمانەوانییەکەی تێدایە: پەنهانی و خێرایی[١٦].

## داواکراوی سێیەم: چۆنێتیی سرووش

سروش یەکێکە لەو پەنهانانەی کە ژیری چۆنێتییەکەی نازانێت، بیستنی فریشتەیەك لە لایەن خوای گەورەوە نە بە شێوەی پیتە نە دەنگ، بەڵکو خوای گەورە زانستێکی پێویست دروست دەکات بۆ وەرگری سرووش، وەك چۆن وتەی خوای گەورە لە رەگەزی وتەی مرۆڤ نییە، بەو شێوەیە ئەو بیستنەی دروستی دەکات بۆ بەندەکەی لە رەگەزی بیستنی دەنگەکانی تر نییە[١٧].

(١٥) بنوارە: مبادیء العقيدة الإسلاميّة: ٢٠٥-٢٠٦.

(١٦) بنوارە: محاضرات في علوم القرآن: ٤٢.

(١٧) بنوارە: العقيدة الإسلاميّة ومذاهبها: ٤٨٤.

## باسی دووەم:
## جۆرەکانی سرووش

پاش پێناسەی سرووش، لەم باسەوە جۆرەکانی سرووش دەناسین کە نێردراون بۆ هەموو پێغەمبەرەکان، هەروەها جۆرەکانی سرووش کە بۆ پێغەمبەری خۆمان ﷺ نێردراوە.

### داواکراوی یەکەم: جۆرەکانی سرووش

سرووش لەسەر سێ شێوەیە:

١- ئەو سرووشەی کە بە بێ دەنگێکی بیستراوە، ئەوەش ئەو خستنە دڵەیە لە بە ئاگاییدا لەسەر شێوەی زانستێکی پێویست کە ناتوانێت گومانی تێبخات[18]: وەك چۆن خوای گەورە سرووشی کرد بۆ دایکی موسی -وەك باس کرا- نموونەی تری فەرموودەی پێغەمبەرە ﷺ :" ما تركت شيئا مما أمركم الله به إلا وقد أمرتكم به ولا تركت شيئا مما نهاكم عنه إلا وقد نهيتكم عنه وإن الروح الأمين قد نفث في روعي أنه لن تموت نفس حتى تستوفي رزقها فأجملوا في الطلب" واتە: بە راستی رۆحی متمانەدار فوی کرد لە دڵم [19]، کە هیچ کەس نامرێت هەتا بەشە رۆزیی خۆی تەواو نەکات...[20].

٢- خەوی راست: واتە ئەو خەوە دروستەی کە دێتە دی وەك شەبەقی بەرەبەیان لە روونی و ئاشکرایدا[21]، وەك چۆن خوای گەورە سرووشی کرد بۆ حەزرەتی إبراهیم عليه السلام کە إسماعیلی کوڕی سەرببڕێت، نموونەی تری سەرەتای

---

([18]) بنوارە: مناهل العرفان في علوم القرآن: ٤١، ووحي الله: ١٠٣.

([19]) الرّوع: دەروون، یان جێگەی ترس و لەرز کە دڵە، یان ژیری. بنوارە: مشارق الأنوار: ٣٠٢/١، وغريب الحديث، ابن سلام: ٢٩٩/١، وغريب الحديث، ابن الجوزي: ٤٢١/١.

([20]) رواه الشّافعيّ في مسنده: ٢٣٣/١.

([21]) بنوارە: مناهل العرفان في علوم القرآن: ٤١، والعقيدة الإسلاميّة ومذاهبها: ٤٨١.

دەستپێکردنی سرووش بوو بۆ پێغەمبەر ﷺ لە خەونی راستدا[٢٢]، هەر خەونێکی ببینیایە وەك شەبەقی بەرەبەیان دەهاتە دی، وەك لەم فەرمودە دروستەدا هاتووە: 

دایکی ئیمانداران، عائیشە، دەفەرموێت: "سەرەتای دەست پێ کردنی سرووشی پێغەمبەر ﷺ خەوی راست بوو، هەر خەوێکی ببینیایە وەك شەبەقی بەرەبەیان دەهاتە دی"[٢٣]، واتە بە دیاردەیەکی روون و ئاشکرا هاتووە کە هیچ گومانێکی تێدا نەبێت[٢٤]. ئەمە ئامادەباشی بوو بۆ پێغەمبەر ﷺ بۆ ئەوەی کە لە بە ئاگاییدا سرووش دابەزێتە سەری، وەك (ابن حجر) دەڵێت: "بە خەو دەستی پێ کرد بۆ ئەوەی ئامادەباش بێت و سەرەتایەك بێـت بۆ بەئاگایی"[٢٥].

هیچ بەشێك لە قورئانی پیرۆز بە خەون دانەبەزیوە و هەموو لە بەئاگاییدا بووە، بە پێچەوانەی ئەوانەوە کە دەڵێن سورەی (الکوثر) لە خەودا دابەزیوە، لەبەر فەرمودەکەی ئەنەس ﷺ کە دەڵێت: ((بينا رسول الله ذات يوم بين أظهرنا إذ أغفى إغفاءةً، ثمَّ رفع رأسه متبسماً، فقلنا: ما أضحكك يا رسول الله؟ قال: ((أُنزلت عليَّ آنفاً سورة، فقرأ: ((بسم الله الرَّحمن الرَّحيم إِنَّا أَعْطَيْنَاكَ الْكَوْثَرَ، فَصَلِّ لِرَبِّكَ

---

([٢٢]) زۆربەی خەو لە جۆری هەڵەج و بەڵەجە، بە هۆکاری خۆی کار لە خەیاڵی خەوتوو دەکات، خەوی راست جۆرێکە لە پەردە لابردن و دەرکەوتنی راستییەکان بۆ دەروونی کەسێك ئامادەباشی و تێگەیشتنی هەبێت لەبەر سافیی دەروونی، پاش خۆ خەریککردنی بە خستنەگەڕی هەستیارەکانی، خەوی پێغەمبەران جۆرێکە لە سرووش و تەشریعی پێ دەکرێت و دەروونی پێ ئامادە دەکرێت بۆ وەرگرتنی فەرموودەی خودایی. بنواڕە: الوحي المحّدي: ٩٤.

([٢٣]) رواه البخاريّ في صحيحه: ٤/١، باب كيف كان بدء الوحي إلى رسول الله –صلّى الله عليه وسلّم- ، رقم الحديث: (٣) من حديث عائشة.

([٢٤]) بنواڕە: الوحي المحّدي: ٩٣.

([٢٥]) فتح الباري: ٢٣/١.

وَانْحَرْ، إِنَّ شَانِئَكَ هُوَ الْأَبْتَرُ))... [٢٦]، واته: له كاتێكدا پێغەمبەری خوا ﷺ ڕۆژێكیان له نێوانماندابوو، له پڕ به ئاگا نەما، پاشان سەری بەرزكردەوە بە زەردەخەنەوە، وتمان: بە چی پێكەنیت ئەی پێغەمبەری خوا؟ فەرموی: تۆزێ لەمەوپێش سورەتێك دابەزی بۆم، دەستی كرد بە خوێندنەوەی سورەتی كەوسەر. ڕەنگە ئەم ئاگا نەمانە ئەو حاڵەتە بێت كە سرووشی بۆ دادەبەزی[٢٧].

خەوی راست و خستنە دڵ بۆ غەیری پێغەمبەرانیش هەیە و تایبەت نین تەنها بە پێغەمبەرانەوە، وەك پێغەمبەر ﷺ دەفەرموێت: ((لم يبقَ من النّبوَّة إلاَّ المبشِّرات، قالوا: وما المبشِّرات؟ قال: الرّؤيا الصّالحة )) [٢٨]،[٢٩]، واته: هیچ شتێك له پێغەمبەرایەتی نامێنـێت له پاش من بێجگه له موژدەدەرەكان، وتیان: موژدەدەرەكان چییە؟ فەرمووی: خەوی راستە.

٣- ئەو شێوەیە كە گوێبیستی وتەی خودا دەبێت لە بە ئاگاییدا، بەڵام بە بێ بینینی قسەكەر، بەڵكو لە پشت پەردەوە، بە شێوەیەك خوای گەورە قسەی خۆی گوێبیست بكات بەبێ ناوەندێكی گەیەنەر، وەك چۆن خوای گەورە موسای گوێبیستی قسەی خۆی كرد بە بێ ناوەند، وەك دەفەرموێت: (فَلَمَّا أَتَاهَا نُودِيَ يَا مُوسَى (١١) إِنِّي أَنَا رَبُّكَ فَاخْلَعْ نَعْلَيْكَ إِنَّكَ بِالْوَادِ الْمُقَدَّسِ طُوًى (١٢) وَأَنَا اخْتَرْتُكَ فَاسْتَمِعْ لِمَا يُوحَى (١٣) إِنَّنِي أَنَا اللَّهُ لَا إِلَهَ إِلَّا أَنَا فَاعْبُدْنِي وَأَقِمِ الصَّلَاةَ لِذِكْرِي (١٤) إِنَّ السَّاعَةَ ءاَتِيَةٌ أَكَادُ أُخْفِيهَا لِتُجْزَى كُلُّ نَفْسٍ بِمَا تَسْعَى (١٥) (طه: ١١-١٥)، واته: كاتێك موسا هاتە لای دارەكە، بانگكرا: ئەی موسا، من خۆمم پەروەردگاری تۆم،

---

([٢٦]) رواه مسلم في صحيحه: ١/٣٠٠، كتاب الصّلاة، باب حجَّة من قال: البسملة آية من أوّل كلّ سورة سوى براءة، رقم الحديث: (٤٠٠)، من حديث أنس.

([٢٧]) بنوارە: مباحث في علوم القرآن، منّاع القطّان: ٣٧.

([٢٨]) رواه البخاري في صحيحه: ٦/٢٥٦٤، كتاب التَّعبير، باب المبشّرات، رقم الحديث: (٦٥٨٩)، من حديث أبي هريرة.

([٢٩]) بنوارە: الوحي المحمّدي: ٩٣، ومباحث في علوم القرآن، منّاع القطّان: ٣٨.

بۆیە نەعلەکانت داکەنە، چونکە تۆ لە دۆڵە پیرۆزەکەی (طوی)ی، من هەڵمبژاردووی بۆیە گوێ بگرە لەوەی سرووش دەکرێ بۆت، منم خودا کە هیچ خودایەك نییە بێجگە لە من، بۆیە بم پەرستە و نوێژ بکە بۆ یادی من، بە دڵنیاییەوە رۆژی دوایی دێت، خەریکە بیشارمەوە بۆ ئەوەی هەرکەسێك پاداشتی هەوڵی خۆی وەربگرێتەوە.

هەر بەو شێوەیە ئەو فریشتانەی خوای گەورە قسەی لەگەڵ کردن دەربارەی ئافراندنی ئادەم ﷺ، وەك ئەوەی بۆ پێغەمبەری خۆمان روویدا ﷺ لە شێوەی ئیسرا و میعراجدا[٣٠]، هیچ بەشێك لە قورئان بەو شێوەیە دانەبەزیوە[٣١].

٤- ئەو شێوەیە کە خوای گەورە متمانەداری سرووش لە فریشتەکان بنێرێت کە جوبرەئیلە ﷺ، پێغەمبەرەکە شێوەی دەبینێت و گوێی لە دەنگی دەبێت و ئەویش سرووش دەگەیەنێت بە پێغەمبەرە مرۆڤەکە، ئەمە بەناوبانگترین و زۆرترین شێوەکانی سرووشە و قورئانی پیرۆز هەمووی بەم شێوەیە دابەزیوە. ئەمەش لە زاراوەدا پێناسە کراوە بە سرووشی ئاشکرا (الوحي الجلي) وەك خوای گەورە دەفەرموێت: (زَلَ بِهِ الرُّوحُ الْأَمِينُ، عَلَى قَلْبِكَ لِتَكُونَ مِنَ الْمُنذِرِينَ، بِلِسَانٍ عَرَبِيٍّ مُّبِينٍ) (الشعراء: ١٩٣- ١٩٥) واتە: رۆحی متمانەدار (جوبرەئیل) ئەم قورئانەی دابەزاندووە بۆ سەر دڵت، بۆ ئەوەی ببیت بە یەکێك لە ئاگادارکەرەوەکان، بە زمانێکی روون و ئاشکرا.

هەروەها خوای گەورە لە ئایەتێکدا هەموو ئەو شێوانەی سرووشی کۆکردووەتەوە، وەك دەفەرموێت: (وَمَا كَانَ لِبَشَرٍ أَن يُكَلِّمَهُ اللَّهُ إِلَّا وَحْياً[٣٢] أَوْ مِن

---

([٣٠]) بنوارە: الوحي المحمّدي: ٩٣.

([٣١]) بنوارە: مباحث في علوم القرآن، منّاع القطّان: ٣٨.

(٣٢) ئیمامی فەخری رازی لە راڤەی ئەم ئایەتەدا فەرمویەتی: (بزانە هەر یەك لەم سێ بەشە سرووشە، ئەوە نەبێت کە خودای گەورە بەشی یەکەمی ناوناوە سرووش، چونکە ئەوەی دەخرێتە دڵەوە بە یەك

وَرَاء حِجَابٍ أَوْ يُرْسِلَ رَسُولاً فَيُوحِيَ بِإِذْنِهِ مَا يَشَاءُ إِنَّهُ عَلِيٌّ حَكِيمٌ [٣٣]›) (الشورى: ٥١)، واته: هیچ مرۆڤێك بۆی نەبووە خوای گەورە قسەی لەگەڵدا بكات بێجگە لەوەی كە لە ڕێی سرووشەوە بێت، یان لە پشت پەردەوە، یان پەیامبەرێك بنێرێت بە ڕەزامەندیی خوا سرووش بكات بۆ هەر كەسێك خوای گەورە بیەوێت، خوای گەورە خۆی بەرز و دانایە[٣٤].

## دواكراوی دووەم:

## شێوەكانی دابەزینی جوبرەئیل ﷺ بۆ لای پێغەمبەر ﷺ

دابەزینی جوبرەئیل ﷺ بۆ لای پێغەمبەر ﷺ چەند شێوەیەكی جیاوازی هەبووە، ئەوانەش:

١) لەسەر شێوەی ڕاستی فریشتەیی خۆی كە خوای گەورە دروستی كردووە، بێتە لای پێغەمبەر ﷺ، وتراوە كە هیچ پێغەمبەرێك بێجگە لە موحەممەد ﷺ جوبرەئیلی بەم شێوەیە نەبینیوە و زانایان و ڕاڤەكاران كۆن لەسەر ڕوودانی ئەم جۆرە سرووشە بۆ پێغەمبەر ﷺ دوو جار[٣٥].

٢) لەسەر شێوەی پیاوێك بێتە لای پێغەمبەر ﷺ قسەی لەگەڵ بكات، وەك لە سەحیحی بوخاریدا هاتووە: ((وأحياناً يتمثّل لي الملك رجلاً فيكلّمني، فأعي ما

---

جاره، بۆیه زاراوەی سرووش (وحي) بۆ ئەو تەرخان كراوە، ئەمە قسەی جیاكردنەوەی ئەم بەشانەیە لە یەكتر)، بنوارە: التّفسير الكبير: ١٦٠/٢٧.

([٣٣]) بنوارە: مبادىء في العقيدة الإسلاميّة: ٢٠٥-٢٠٦، ووحي الله: ١٠٤.

([٣٤]) بنوارە: تفسير النّسفي: ١٨٨/٤، وتفسير البيضاوي: ٢٥٤/٥، وتفسير الجلالين: ٧٠١، وتفسير البغوي: ٢٤٧/٤، والوحي ودلالاته في القرآن الكريم والفكر الإسلامي: ١٣٩، ووحي الله: ١٠٦.

([٣٥]) رواه البخاريّ في صحيحه: ٤/١، باب كيف كان بدء الوحي إلى رسول الله –صلّى الله عليه وسلّم– ، رقم الحديث: (٢)، من حديث عائشة.

یقول))[٣٦]، واتە: جارجار لە شێوەی پیاوێکدا دێتە لام قسەم بۆ دەکات، منیش لە قسەکانی تێدەگەم.

حەمیدی: (وهو أهونة عليّ)[٣٧]ی زیادکردووە، لێرەدا گونجان دروست دەبێت لە نێوان پێدەر و وەرگر، پێغەمبەرە مرۆڤەکە ئارام دەبێت لە کاتی بیستنی سرووش لە پەیامبەرە فریشتەکە و دڵنیا دەبێت لێی وەك دڵنیابوونی مرۆڤێك بۆ برا مرۆڤەکەی[٣٨].

لەم شێوەیەدا جوبرەئیل لە وێنەی کەسێکی نەناسراودا خۆی دەنواند، یان ئاشنا بە پێغەمبەر ﷺ و هاوەڵەکانی، ئەویش هاوەڵی خۆی (دوحیەی کەلبی) (٤٥ ك) نێردراوی پێغەمبەر ﷺ بۆ قەیسەری رۆم، چونکە جوانترین گەنج بووە[٣٩].

بەڵام لەم حاڵەتەدا خودی جوبرەئیل نەبووە بە مرۆڤ و مەرج نییە لە حاڵەتی رۆحانی دابڕابێت بە تەواوەتی، بەڵام لە شێوەی مرۆڤدا بووە لەبەر پێغەمبەر ﷺ کە مرۆڤ بووە[٤٠].

٣- بە پەنهان دەهاتە لای پێغەمبەر ﷺ بێ ئەوەی کەس بیبینێت، کاریگەری و گۆڕان و هەڵچوون لەسەر رووی دەردەکەوت، وەك دەنگی خەوتووی لێ دەبیسترا، لە کۆڕەکەی بێ ئاگا دەبوو وەك یەکێك بێهۆش کەوتبێ، هەرچەند نە بێ ئاگابوون بووە نە لە هۆش چوون، بەڵکو داچوون بووە لە پەیوەندی لەگەڵ

---

(٣٦) رواه الحميديّ في مسنده: ١٢٤/١، رقم الحديث: (٢٥٦)، من حديث عائشة.

(٣٧) بنوارە: مباحث في علوم القرآن، منّاع القطّان: ٣٩، ومباحث في علوم القرآن، د. صبحي الصّالح: ٢٨.

(٣٨) رواه مسلم في صحيحه: ٣٧/١، كتاب الإيمان، باب بيان الإيمان والإسلام والإحسان...، رقم الحديث: (٨).

(٣٩) بنوارە: مباحث في علوم القرآن، منّاع القطّان: ٣٩، والوحي ودلالاته في القرآن الكريم والفكر الإسلامي: ١٤١.

(٤٠) بنوارە: مباحث في علوم القرآن، منّاع القطّان: ٣٩، وأصول الدّين الإسلامي: ٢٧٦.

جوبرەئیلدا و دابڕان بووە لە حاڵەتی مرۆڤایەتیی ئاسایی، ئەمەش کاریگەریی هەبووە لەسەر جەستەی، هەستی بە قورسییەکی زۆر کردووە هەتا وای لێهاتووە ئارەق چین چین لە ناوچەوانی رژاوە لە رۆژی زۆر سارددا[٤١]،[٤٢].

جاری وای هەبووە کاریگەریی سرووش لەسەر پێغەمبەر ﷺ وەك زرەی زەنگ بووە کە لە گوێیدا بزرنگێتەوە، ئەمەش ناڕەحەتترین جۆرەکانی سرووش بووە، وەك چۆن پێغەمبەر ﷺ باسی ئەم حاڵەتەمان بۆ دەکات و دەفەرموێت: ((هەندێك جار وەك زرەی زەنگ[٤٣]، دێتە لام، ئەمەش ناڕەحەتترینیانە لەسەر من، کە دووردەکەوێتەوە لێم[٤٤]، تەواو لە هەموو وتەکانی گەیشتوم))[٤٥].

مەبەست لەمە دەنگ و سەدایەکی بیستراوە لە سەرەتادا کە بەر گوێی دەکەوێت، ئامادەی دەکات بۆی، هەستی بیستنی خاڵی بێت بۆ سرووش و جێ نەمێنێت بۆ وەرگرتنی دەنگی تر، پاشان بە تەواوەتی سرووش وەربگرێت[٤٦].

ئەم دەنگە بەهێزە کە لەم حاڵەتەدا هەیە، هەموو ئاگایی کۆدەکاتەوە و هۆکارەکانی لێ وردبوونەوەی دەورووژێنێت، هەروەها دەروونی ئامادە دەبێت بە

---

([٤١]) ئیبنولقەییم لە (زاد المعاد) دەربارەی کاریگەریی ئەو توندییە وتوویەتی: هەتا ئەو رادەی کە ولاخەکەی ژێری نوشتاوەتەوە سەر زەوی ئەگەر لەو کاتەدا سوار بووبێت، جارێك بەو توندییە سرووشی بۆ هات ئەژنۆی لەسەر ئەژنۆی زەیدی کوری سابیت بوو، هێندە کێشی لەسەری زیاد بوو خەریك بوو ئەژنۆی ورد بکات: ١/ ٨٠.

([٤٢]) بنوارە: مناهل العرفان: ٤١.

([٤٣]) مەبەستی خۆشەویست ﷺ بەم لێکچوواندنە ئەوە بووە کە وەك زرەیەکی بەردەوامی ئاسن بێت کە لە زەنگ دێت، نەك وەك دەنگێك لە پیتی رێکخراو پێکهاتبێت. دیارە هۆکاری ئەوەش بوونی فریشتەکە بووە، با خۆشەویستیش ﷺ کەسیانی نەدیبێت لەو کاتەدا. بنوارە: الوحي المحمّدي: ٩٣.

([٤٤]) يفصم: على وزن يضرب: أي ينفكّ وينجلي. بنوارە: الفائق في غريب الحديث والأثر: ١٢٢/٣.

([٤٥]) رواه البخاريّ في صحيحه: ٤/١، باب كيف كان بدء الوحي إلى رسول الله –صلّى الله عليه وسلّم– ، رقم الحديث: (٣) من حديث عائشة.

([٤٦]) بنوارە: الإتقان في علوم القرآن: ١٢٧/١.

هەموو تواناکانیەوە بۆ وەرگرتنی سرووش، هەموو تواناکانی دەرککردنی کۆدەکاتەوە بۆ وەرگرتن و لەبەرکردن و تێگەیشتنی[٤٧].

جاری وا هەبووە ئامادەبووان گوێیان لە دەنگێك بووە لە رووی پێغەمبەر ﷺ وەك ونگەی هەنگ وابووە، بەڵام هیچی لێ تێنەگەیشتوون، بەڵام پێغەمبەر ﷺ گوێی لێ بووە تەواو تێگەیشتووە لەو سرووشە[٤٨].

وەك باسمان کرد، ئەم حاڵەتە لە سەختترین جۆرەکانی سرووش بووە بۆ پێغەمبەر ﷺ، چونکە دابڕان بووە لە حاڵەتی مرۆڤایەتی و جسمانی و پەیوەندی کردن بووە بە حاڵەتی فریشتەیی و رۆحانییەوە، حاڵەتەکەی پێشەوە پێچەوانەی ئەمە بوو، گۆڕینی حاڵەتی فریشتەکە بوو لە رۆحانیەتەوە بۆ مرۆڤایەتی[٤٩].

خوای گەورە دەفەرموێت: (إِنَّا سَنُلْقِي عَلَيْكَ قَوْلاً ثَقِيلاً ) (سورة المزمل: ٥)، واتە: ئێمە وتەیەکی قورس دەدەین بەسەرتدا.

وتراوە: ئەم جۆرە سرووشە قورسە بۆ دابەزینی ئایەتەکانی ئاگادارکردنەوە و هەڕەشە کردن بووە[٥٠].

---

([٤٧]) بنوارە: مباحث في علوم القرآن، منّاع القطّان: ٣٩.

([٤٨]) بنوارە: مناهل العرفان في علوم القرآن: ٤١.

([٤٩]) بنوارە: الوحي المحمّدي: ٩٣، ومباحث في علوم القرآن، منّاع القطّان: ٣٩.

([٥٠]) بنوارە: الإتقان في علوم القرآن: ١/١٢٧، ومباحث في علوم القرآن، د. صبحي الصّالح: ٢٧، والنّبأ العظيم: ٨٨.

## داواکراوی سێیەم:

## حاڵی پێغەمبەر ﷺ لە کاتی سرووشتدا

چەند دیاردەیەك هەبوو لە پێغەمبەری ڕوو دەدا ﷺ کاتێك نیگای بۆ دەهات، کە ئەمەش بەڵگەیە لەسەر ئەوەی نیگا خۆدوان نەبووە، ئەوانەش:

١– پێغەمبەر ﷺ گوێی لە زڕەیەکی گەورە دەبوو، وەك زڕەیەکی بەردەوامی زەنگ، وەك دەفەرموێت: (هەندێك جار وەك زڕنگەی جەڕەس دێتە لام، ئەمەش ناڕەحەتترین شێوەیەتی کە لێم دووردەکەوێتەوە، هەرچی وتووە لێی تێگەیشتووم)[٥١].

٢ـ ئارەق لە ناوچەوانی دەڕژێ لە ڕۆژی زۆر سارددا، عائیشە فەرمویەتی: "بینیومە کە نیگای بۆ دادەبەزێت لە ڕۆژی زۆر سارددا و لێی جیادەبێتەوە لە کاتێکدا کە ناوچەوانی بە خوڕ ئارەقی لێ دەڕژێت)[٥٢].

٣ـ ڕەنگی دەگۆڕێت هەتا وەك خۆڵەمێشی لێی دێت، عوبادەی کوڕی صامت فەرمویەتی، پێغەمبەر ﷺ ئەگەر نیگای بۆ ببهاتایە ڕوومەت و ناوچەوانی سارد دەبوون[٥٣] و هاوەڵانی بێدەنگ دەبوون لەگەڵی و هیچ کامیان قسەی بۆ نەدەکرد"[٥٤]، لە ریوایەتێکی تردا دەڵێت: کاتێك سرووش دادەبەزی بۆ سەر پێغەمبەر، سەری دادەنا و هاوەڵانیشی سەریان دادەنا، کە دووردەکەوتەوە لێی[٥٥]، "سەری بەرزدەکردەوە"[٥٦].

---

([٥١]) رواه البخاريّ في صحيحه: ٤/١، باب كيف كان بدء الوحي إلى رسول الله –صلّى الله عليه وسلّم- ، رقم الحديث: (٣) من حديث عائشة.

([٥٢]) رواه البخاريّ في صحيحه: ٤/١، باب كيف كان بدء الوحي إلى رسول الله –صلّى الله عليه وسلّم- ، رقم الحديث: (٣) من حديث عائشة.

([٥٣]) أي تلوّن وصار كلون الرَّماد. بنواڕە: غريب الحديث، لابن الجوزي: ٣٧٣/١.

([٥٤]) رواه عبد الرّزاق في مصنّفه: ٣٢٩/٧، رقم الحديث: (١٣٣٥٩).

([٥٥]) أي انكشف عنه وذهب وفرج عنه. بنواڕە: مشارق الأنوار: ١٧/١.

لەبەر ئەوە پێغەمبەر ﷺ دەموچاوی دادەپۆشی بە پارچە کاڵایەك کە سرووشی بۆ دادەبەزی، نرکەیەکی هەبوو لەو ئازارەی دەیچێشت لە کاتی سرووشدا.□

٤ـ هاوەڵان لە کاتی دابەزینی سرووشدا بۆ سەر پێغەمبەر ﷺ ونگەیەکی زۆریان گوێ لێ دەبوو وەك ونگەی هەنگ کە لە شانەکەیەوە دەردەچێت.□

عومەری کوڕی خەتاب فەرمویەتی: کە سرووش دادەبەزییە سەر پێغەمبەر ﷺ گوێمان لە ونگەیەك دەبوو لە دەموچاوی وەك ونگەی هەنگ(٥٧).

٥ـ جەستەی قورس دەبوو، ئیبن عباس (درودی خوایان لەسەر بێت) دەڵێت: پێغەمبەر ﷺ چارەسەری وەردەگرت لە دابەزینی قورئاندا لەبەر ناڕەحەتیی سرووش لەسەری(٥٨).□

زەیدی کوڕی سابیت دەڵێت: رانی پێغەمبەر ﷺ لەسەر رانم قورس دەبوو تا ئەو رادەیەی ترساوم رانم ورد ببێت(٥٩).

ئەمەش قورئانی پیرۆز دووپاتی دەکاتەوە (إِنَّا سَنُلْقِي عَلَيْكَ قَوْلاً ثَقِيلاً)(٦٠)، واتە: ئێمە ئەی موحەممەد قسەیەکی قورس دەدەین بەسەرتا، ئەمە هیچ کەسێك

---

(٥٦) رواه مسلم في صحيحه: ١٨١٧/٤، باب عرق النّبي –صلّى الله عليه وسلّم- في البرد وحين يأتيه الوحي، رقم الحديث: (٢٣٣٥)، من حديث عبادة بن الصّامت.

(٥٧) الأحاديث المختارة: ٣٤٢/١، رقم الحديث: (٢٣٤).

(٥٨) رواه البخاريّ في صحيحه: ٦/١، باب كيف كان بدء الوحي إلى رسول الله –صلّى الله عليه وسلّم- ، رقم الحديث: (٥).

(٥٩) رواه أحمد في مسنده: ١٨٤/٥، رقم الحديث: (٢١٦٤١)، والبيهقيّ في سننه الكبرى: ٢٣/٩، باب من اعتذر بالضّعف..، رقم الحديث: (١٧٥٩٤).

(٦٠) دە قسە هەیە دەربارەی مەبەست بە وشەی (الثقل) قورسایی، بنواڕە: وحي الله: ١١٤-١١٥.

تەحەمولی ناکات بێجگە لە پێغەمبەران، بۆ ئەوەی جەستەی رابێت لەسەر ناڕەحەتییەکانی پێغەمبەرایەتی[٦١].

هەموو ئەم دیاردانە وەك باسیان دەکەین، بەڵگەن لەسەر ئەوەی سرووش جیاوازە لە دەروونی پێغەمبەر ﷺ، لەبەرئەوەی خۆ دوان و خەتەرە و خەیاڵ ئەم دیاردانەیان لەگەڵدا نییە، وەك ئازار و ونگە و ساردبوونەوەی دەموچاو و ئارەق رشتن لە رۆژی زۆر ساردا.

(٦١) بنوارە: مباحث في علوم القرآن، د. صبحي الصّالح: ٢٨، والنّبأ العظيم: ٨٨-٨٩.

## باسی سێیەم:
## بەڵگە زانستی و ژیرییەکان لەسەر ئەگەری بوونی سرووش

لەبەر ئەوەی دوژمنانی سرووش باوەڕیان بە شەریعەت و بەڵگەکانی نییە بۆ ئەوەی بەڵگەیەیان بۆ بێنینەوە تێیدا لەسەر سرووش، بەڵکو پشت دەبەستن بە عەقڵ بەو شێوەی بەکەڵکیان دێ، هەروەها پشت بەو زانستە دەبەستن بە پێی زاراوەی تازەی خۆیان، کە گومان دەخاتە ئەم باسەوە و پشت بە ئەو بەڵگە یەکلایکەرەوەیە کە هەست و ماددە پشتگیریی لێ دەکەن، لە کاتێکدا داننانێن بە هەست پێکراوەکان و خۆیان کردووە بە دیلی ماددە و سووکایەتییان کردووە بەوانەی لە لایەن خودا و پێغەمبەرەکانەوەن، سرووش تا رادەیەکی زۆر. بەڵام خودی زانست بەرەو روویان وەستا و بیروڕای گۆڕین لە داننەنان بە جیهانی پاش ماددە، وەك باسی لێوە دەکەین(٦٢).

### داواکراوی یەکەم:
### بەڵگە زانستییەکان لەسەر بوونی سرووش

بەڵگە زانستییەکانم پێش ژیرییەکان خست، لەبەرئەوەی بەڵگە زانستییەکان بەڵگەن لەسەر ئەگەری بوونی سرووش و نزیك خستنەوەی بۆ ژیری و ئەگەری بوونی سرووش تێبینی کراوە لە سەرەتا سەرەکییەکەی سەرەتاکانی بەڵگەی ژیری(٦٣).

(٦٢) بنوارە: مناهل العرفان في علوم القرآن: ٤٢.

(٦٣) بنوارە: مناهل العرفان في علوم القرآن: ٤٢.

**بەڵگەی یەکەم:** خەواندنی موگناتیسی[٦٤]، کە یەکێکە لە بڕیاردراوە زانستییە نەگۆڕەکان، دکتور مس مری ئەڵمانی لە سەدەی هەژدەیەمدا دۆزییەوە و بۆ ماوەی سەدەیەك خۆی و شوێنکەوتووەکانی هەوڵیاندا بۆ چەسپاندنی، کاریان کرد کە زانایان دانی پێدا بنێن و لەوەدا سەرکەوتوو بوون، چونکە زاناکان لە ڕێی زانستەوە دانیان پێدا نا پاش ئەوەی هەزارانیان تاقیکردەوە و دڵنیا بوون لە ئەزمونەکانی و لە کۆتاییدا ئەمانەیان چەسپاند:

١) مرۆڤـ لە ناوەوە ژیرییەکی هەیە زۆر بەرزترە لە ژیرییە ئاساییەکەی.

٢) مرۆڤ لە خەودا دەبینێ و دەبیستێ لە دوورییەکی زۆرەوە، لە پشت پەردەوە دەخوێنێتەوە و هەواڵ دەدا بەوەی ڕوودەدا لە داهاتوودا، لەو شتانەی کە لە جیهانی هەستدا هیچ نیشانەیەك نییە لەسەر ڕوودانیان.

٣) خەواندن چەند پلەیەکی هەیە، لە بەرزەوە بۆ نزم ژیری ناوەوە زیاد دەکات بە پێی پلەی خەواندنەکە.

٤) خەواندن دەگاتە پلەیەك تێیدا ڕۆحی ناوەند لە جەستە دەردەچێت و بە شێوەیەکی نادیار لە پاڵ جەستەیدا خۆی دەنوێنێت، لە کاتێکدا کە جەستە لە مردوو دەچێت ئەگەر پەیوەندییەکی نادیار نەبێ لە میانی ڕۆح و جەستەدا.

٥) لە ڕێی خەواندنەوە بۆیان دەرکەوت کە ڕۆح بوونی هەیە.

٦) ڕۆح سەربەخۆیی تەواوی هەیە لە جەستەدا.

---

([٦٤]) خەواندنی موگناتیسی، بریتییە لە هەستانی مامۆستایەکی شارەزا وەك خەوێنەر بە ئامادەکردنی کەسێکی تر بۆ خەواندن، لە ڕێی تێڕوانینی قووڵەوە بۆ ناوچەوانی کەسەکە، تا وەك خەوتووی لێ دێت، هەستەکانی لەدەست دەدات وەك یەکێکی خەوتوو، هەتا ڕادەیەك ئەگەر دەرزی ئاژن بکرێت هەستی پێ ناکات. لەم کاتەدا خەوێنەرەکە دەسەڵاتی زاڵ دەبێت بەسەر خەوێنراوەکەدا، هەر پرسیارێکی بوێت لێی دەکات و ڕاستەوخۆ ئەویش وەڵامی دەداتەوە، دەتوانێت کاریگەری بکاتە سەر ناخی خەوێنراوەکە، تەنانەت دەتوانێت ناوی یان ئاینی بگۆڕێت، ئەم حاڵەتە تا نزیکەی نیو سەعات پاش بەهۆشهاتنەوەی بەردەوام دەبێت. مناهل العرفان في علوم القرآن: ٤٣، والعقيدة الإسلاميّة ومذاهبها: ٤٨٥.

٧) ڕۆح نافەوتێت بە فەوتانی جەستە.

٨) ڕۆح پەیوەندی دەکات بەو ڕۆحانەی پێش ئەو داماڵراون لە ماددە.

ئەمانە و چەند خاڵێکی تریش کە مەرج نییە هەمووی بە تەواو بزانین، لەگەڵ ئەوەدا کە خودی ئەم زانستە و ئەزمونەکانی و بڕیارەکانی بە تەواو دەزانین، لەبەر ئەوەی لە ڕێی تاقیکردنەوەی زۆرەوە جێگیر بووە و ئەم زانستە سەرخەر و پشتگیری زۆری هەیە لە زانایانی ڕۆژئاوا، بنکەی سەربەخۆ و کتێبی تایبەت هەیە لەسەری و چارەسەرخانەی تایبەتی هەیە کە خەڵکی پێی چارە دەکەن[٦٥].

خوای گەورە لەم چەرخەدا بەڵگەی ڕوون دەردەخات لەسەر دەستی سروشتییەکان، ئەو کەسانەی کە زیاد نکۆڵی دەکەن لە جیهانی پاش ماددە، تا وایان لێهات زیاد هەوڵدەدەن بۆ چەسپاندنی جیهانی دوای ماددە، ئەمەش وەك خوای گەورە دەفەرموێت: (سَنُرِيهِمْ آيَاتِنَا فِي الْآفَاقِ وَفِي أَنفُسِهِمْ حَتَّى يَتَبَيَّنَ لَهُمْ أَنَّهُ الْحَقُّ أَوَلَمْ يَكْفِ بِرَبِّكَ أَنَّهُ عَلَى كُلِّ شَيْءٍ شَهِيدٌ) (سورة فصلت: ٥٣)[٦٦]، واتە: بەڵگە و نیشانەکانی خۆمانیان پیشان دەدەین لە ئاسۆکانی ئاسمان و لە دەروونی خۆیاندا، تا بۆیان دەردەکەوێت کە هەر خودا هەقە، ئایا ئەوەندە بەس نییە بۆ پەروەردگاری تۆ کە ئاگای لە هەموو شتێکە.

خەوەندانی موگناتیسی لە ڕێی زانستەوە ئەگەری بوونی سرووش نزیك دەخاتەوە، چونکە سرووش لە ڕێی فریشتەوە بریتییە لە پەیوەندیی فریشتە بە پێغەمبەرەکەوە، پەیوەندییەك تێیدا یەکەم کاریگەری هەبێ لەسەر دووەم و دووەم لەژێر کاریگەریی یەکەمدا بێت، ئەمەش بە ئامادەباشییەکی تایبەت لە هەردووکیاندا، یەکەم توانای گەیاندن و کاریگەریی هەیە، چونکە تەنها ڕۆحە،

---

(٦٥) بنوارە: مناهل العرفان في علوم القرآن: ٤٢-٤٤، وأصول الدّين الإسلامي: ٢٦٨-٢٦٩، والعقيدة الإسلاميّة ومذاهبها: ٤٨٥.

(٦٦) بنوارە: مناهل العرفان في علوم القرآن: ٤٢-٤٤.

دووەم توانای وەرگرتنی هەیە لەم فریشتەیە، لەبەر سافیی رۆحی و پاکیی دەروونی کە گونجاوە لەگەڵ پاکیی فریشتەکەدا. کاتێك کە پێغەمبەرەکە لەژێر دەسەڵاتی فریشتەکەدا دەبێت، لە حاڵی ئاسایی خۆی دادەماڵدرێت و کاریگەریی ئەو گۆڕانە لەسەری دەردەکەوێت، رۆدەچێ لە وەرگرتن لە فریشتەکە و ئەوەی وەریدەگرێ لە دەرونیا دەچەسپێت تا ئەو کاتەی فریشتەکە لێی جیادەبێتەوە، ئەویش دەگەڕێتەوە سەر حاڵی ئاسایی خۆی، هەست دەکات ئەوەی وەری گرتووە لە دەروونیا جێگیر بووە و بە دڵ لەبەری کردووە، وەك ئەوەی لە پەڕەی دڵیدا نووسرابێتەوە.

دەردەکەوێت کە ئەگەر دروستکراوێك بتوانێت کاریگەری بکاتە سەر دەروونی دروستکراوێکی تر لە رێی خەواندنی موگناتیسییەوە، ئەی چۆن خاوەنی هێز و تواناکان ناتوانێت کاریگەری بکاتە سەر دەروونی هەر کەسێك لە بەندەکانی لە رێی سرووشەوە، لەگەڵ ئەوەدا کە توانای هەموو شتێکی هەیە[٦٧].

**بەڵگەی دووەم:** مرۆڤـ لەم سەردەمەی کۆتاییدا هەندێك ئامێری داهێناوە کە لە رێیەوە پەیوەندی بکات بە هەرکەسێکەوە بیەوێت، هەرچەندە دووریش بێت و دەتوانێ گوێی لە دەنگی بێت، بیبینێت، تێگەیشتن لە نێوانیاندا دروست ببێت، وەك تەلەفۆن و بێتەل و مایك و مۆبایل و فاکس و رادیۆ و ئەنتەرنێت و کەناڵە ئاسمانییەکان، ئەگەر ئەوانە هەمووی لە توانای مرۆڤـدا بن، ئەی چۆن خوای گەورە توانای ئەوەی نابێت کە سرووش بنێرێت بۆ هەندێك لە بەندەکانی خۆی لە رێگەی فریشتەوە بێت یان نا[٦٨].

---

(٦٧) بنوارە: مناهل العرفان في علوم القرآن: ٤٢-٤٣، والعقيدة الإسلاميّة ومذاهبها: ٤٨٥.

(٦٨) بنوارە: مناهل العرفان في علوم القرآن: ٤٤.

**بەڵگەی سێیەم:** مرۆڤ توانویەتی لە رێگەی زانستەوە هەندێك قەوان پڕبكاتەوە لە دەنگ و ئاواز، بە شێوەیەك بە تەواوەتی بێ جیاوازی بێت لە سەرچاوەكەی تا رادەیەك كە قەوانێك توانای وەرگرتنی زیاتر لە دە هەزار پەرتووكی هەیە.

لە پاش ئەم داهێنانانە چۆن مرۆڤ لە توانای خوای دووردەخاتەوە كە دەروونی هەندێك مرۆڤ لە بەندە تایبەتییەكانی خۆی پڕ بكات بە وتەی خۆی بۆ رێنیشاندانی مرۆڤایەتی.

**بەڵگەی چوارەم:** لە ژیاندا هەندێ ئاژەڵ دەبینین وەك مێرووله و هەنگ، كە كاری سەرسوڕهێنەر دەكەن و سیستەمی زۆر تایبەتیان هەیە، بە شێوەیەك زۆر بە دووری دەزانی كە ئەمە لە خودی ئەم مێرووە وردەوە دەربچێت. یان سروشتێكی وای هەیە كە دڵنیامان دەكات لە لایەن ویستێكی بەرزەوە سرووشی بۆ دەكرێت و دەخرێتە دڵیەوە كە بەو كارە سەرسوڕهێنەر و ناوازانە هەستێت، لەو وردەكارییانەی ژیانیان، ئەگەر ئەمە راست بێت بۆ جیهانی ئاژەڵ، لە جیهانی مرۆڤدا راستتر دەبێت، چونكە ئامادەباشیی مرۆڤ بۆ پەیوەندی كردن بە ئاسمانەوە بەهێزترە و سرووشیش یەكێكە لەو رێگایانە.

**بەڵگەی پێنجەم:** ئەو بلیمەتییەی بەخشراوە بە هەندێك كەس حاڵەتێكی خودایییە، سەرچاوەی خستنە دڵە بۆ مرۆڤ.

**بەڵگەی شەشەم:** زانستی سەردەم بڕیاری داوە كە هەندێك مرۆڤ كاری بەدەر لە ئاسایی لە رۆحانیەتی دەركەوتەوە، بە شێوەیەك كە زانایانی پێشتر خەویشیان پێوە نەبینیوە. بەڵگە هێنانەوە لە جیهانی ماددەدا بۆ ئەم كارە نەتوانراو بووە، ئەم دیاردانەیان تاقیكردووەتەوە و گەورەترین جادووگەرانی زەوییان بۆ ئامادە كردووە، بۆیان دەركەوتووە كە ئەمە هیچ پەیوەندیی بە جادووەوە نییە، بەڵكو حاڵەتێكی رۆحانییە، بلیمەتی و خێرایی دەست كاریگەریی لەسەری نییە، ئیتر

چۆن بە دوور دەزانرێت کە خوای گەورە هەندێك لە بەندە هەڵبژێردراوەکانی خۆی بە سرووش تایبەتمەند بکات[٦٩].

**بەڵگەی حەوتەم:** زۆر بونەوەر هەیە کە نابینرێت، وەك هەوا و موگناتیس و ژیریی و ڕۆح و زۆر لە تیشکە نەبینراوەکان وەك تیشکی ئەلفا و بێتا و گاما و سینی کە جەستەی مرۆڤ دەبڕێت لە کاتی وێنەگرتندا و یارمەتیی پزیشك دەدات بۆ دەستنیشانکردنی نەخۆشییەکەی، تیشکی سەرو وەنەوشەیی و ژێر سوور، تەزوی کارەبا کە لە وایەرە گەیەنەرەکەدا نابینرێت، مرۆڤ کاریگەریی ئەم بوونەوەرانەی زانیوە لەم چەرخەدا، ئایا ئەمە ئەوە دەگەیەنێت کە پێشتر نەبوبێت مادام مرۆڤ پێشتر نەیدۆزیوەتەوە؟! چونکە مرۆڤ لەو سەردەمە نەیناسیون لەگەڵ ئەوەدا کە مرۆڤ دەسەڵاتی زانینی زۆر لەو شتانەی نییە کە ئێستا هەن بە بڕیاری زاناکان.

هەموو ئەم زانیارییانە دەبێ کاریێ بکەن کە مرۆڤ زیاتر باوەڕ بە ڕووداوی سرووش بکات[٧٠].

## داواکراوی دووەم:

## بەڵگە ژیرییەکان لەسەر بوونی سرووش

لەوەی پێشترەوە بۆمان دەرکەوت کە ئەگەری بوونی سرووش نزیکە لە ڕوودانەوە.

بەڵگەی ژیریی لەسەر ڕوودانی سرووش ئەوەیە کە پێغەمبەری ڕاستگۆ و بێ گوناح هەواڵی داوە پێمان و هەرشتێك ئەو هەواڵەی پێدابێن هەقە و جێگیرە، ئەوەش داواکراوە، بەڵگە لەسەر ئەوەی کە پێغەمبەر ﷺ هەواڵی ڕوودانی داوە،

---

([٦٩]) بنواڕە: مناهل العرفان في علوم القرآن: ٤٥-٤٦.

([٧٠]) بنواڕە: وحي الله: ١٠١-١٠٢، والعقيدة الإسلاميّة ومذاهبها: ٤٨٥-٤٨٦.

ئەوە بوو باسمان کرد لە شێوازەکانی هاتنە خوارەوەی جوبرەئیل عليه السلام لەسەر پێغەمبەر ﷺ. بەڵگە لەسەر ئەوەی کە هەر هەواڵێك ئەو پێیدابێ راستە، ئەو موعجیزانەیە کە خوای گەورە پێی داوە، ئەمەش وەك فەرموودەی خوای گەورەیە بۆ بەندەکانی دەربارەی پشتگیری کردنی لە پەیامبەرەکەی.

بەندەکەم راستی کرد لە هەموو شتێك کە لە لایەن منەوە گەیاندوویەتی و یەك لەوانە ئەوەیە کە من سرووشی بۆ دەنێرم[٧١].

هەروەها ئەگەر ئەقڵ بیربکاتەوە لەو بەڵگە زانستییانەی پێشوو، دڵنیا دەبێت کە سرووش راستییەکی جێگیرە و ئەقڵی ساغ ناتوانێت نکۆڵیی لێ بکات.

---

([٧١]) بنوارە: مناهل العرفان في علوم القرآن: ٤٦.

## باسی چوارەم:
## ئەو گومانانەی ورووژێنراون دەربارەی سرووش و بەرپەرچدانەوەیان

دوژمنانی ئیسلام لە سەردەمی پێغەمبەرەوە ﷺ هەتا ئەمڕۆ لە هەوڵی ورووژاندنی گوماندابوون دەربارەی سرووش، چونکە سەرچاوەی ئاینە.

هەندێك ڕۆژهەڵاتناس کۆششێکی پلان بۆ دانراویان هەبووە، هەندێکیان تەمەنی لەسەر داناوە و هەندێ دەوڵەت ملیۆنەها پارەیان لە پێناویاندا سەرف کردووە، بۆ گومان خستنە ناو قورئان و هێرشیان کردووەتە سەری بە هەموو ئامرازێك دەستیان کەوتبێت، بەڵکو بیانگەیەنێتە شتێك دڵی پێ خۆش بکەن[٧٢]، هەر گومانێك ورووژاندبێتیان گومانێکی هیچ بووە بەرامبەر بە زانست و ژیری، وەك ڕوونی دەکەینەوە:

### داواکراوی یەکەم:
### گومانی ئەوەی سرووش خۆدوانە و خەتەرەیەك بووە لە دەروونی پێغەمبەرەوە ﷺ هەڵقوڵاوە نەك لە دەرەوە، وە بەرپەرچدانەوەیان

سرووش ئەو بنەمایەیە کە هەموو ڕاستییەکانی ئاینی لەسەر بنیات دەنرێت بە بیروباوەڕ و شەریعەتەوە، دڵنیابوون لە سرووش دەروازەیەکە بۆ دڵنیابوون لە هەموو ئەو شتانەی کە پێغەمبەر ﷺ هێناونی، لە هەواڵی نەهانی و فەرمانی تەشریعی. لە پێناو ئەمەدا دوژمنان هەوڵیانداوە گومان بخەنە ئیسلامەوە بە دەستوەردان لە بابەتی سرووش لە ژیانی پێغەمبەردا ﷺ. هەوڵێکی هزریی زۆریان داوە لە پێناو شێواندنی ڕاستی و تێکەڵ کردنی بە خستنە دڵ و خۆدوانەوە، بەڵکو تەنانەت تێکەڵ کردنی بە پەرکەم.

---

([٧٢]) بنوارە: لا يأتون بمثله: ٢٠٤، ومحاضرات في علوم القرآن: ٤٥.

باوەڕهێنان بە سرووش ئەو بنەمایەیە کە باوەڕهێنان بە پێغەمبەرایەتیی لەسەر بنیاتنراوە و ئەو ڕێگەیە کە بیروباوەڕەکان و حوکمە شەرعییەکانی پێهاتووە، بۆیە زۆر لە دوژمنانی ئیسلام دەبینین هەڵدەستن بە گومان تێخستنی وەك باسمان کرد. لەو بابەتەدا ڕێکن لەگەڵ نەفامەکانی قوڕەیش و هاوەڵ بڕیاردەرە دەبەنگەکان لە تۆمەتە بێ سەروبەرەکانیان دەربارەی پێغەمبەری نازدار ﷺ، کە وتویانە: ئەو جادووگەرە یان دێوانەیە یان هۆنەرە، تا رادەیەك هەندێك لە ڕۆژهەڵاتناسان وتوویانە سرووش هیچ نییە بێجگە لە خۆدوان و خستنە دڵ.

ئەمانە دەڵێن: پاکیی ئەم مرۆڤە و بلیمەتی و زیرەکییەکەی و توانای چاوی دڵی و سافیی دەروونی و باوەڕی بە خوای گەورە و بە پێویستیی بەندایەتی بۆی و وازهێنان لە هەموو شتێکی تر، وەك بتپەرستی، ئەمانە هەمووی کاریگەرییان هەبووە لەسەر زانینی پێوەری خێر و شەڕ و ڕەوا و ناڕەوا لە ڕێی خستنە دڵەوە. وردەکاریی بابەتەکانی ئاینی زانیوە لە ڕێی دەروونی خۆیەوە و وای زانیوە کە ئەم شتانەی ئەم بە باشیان دەزانێ لە ئاسمانەوە پێی وتراوە و قورئان هیچ نییە بێجگە لە شوێنەواری هەڵێنجاندنی ژیریی محەممەد کە بە شێوازی خۆی دەریبڕیوە[٧٣].

خاوەنی ئەو هزرە ماددییە پراگماتیزمییە دەڵێن: ئێمە گومانمان نییە لە ڕاستگۆیی محەممەد، لە هاوەڵەکانیدا کە چیی بینیوە و چیی بیستووە، تەنها دەڵێن سەرچاوەی ئەو زانیارییانە خۆیەتی، هیچ شتێکی لە جیهانی پەنهانەوە بۆ نەهاتووە، چونکە پەنهان شتێکە بوونی نییە لە لای ئێمە. هەروەها ئەوەی ئەو

(٧٣) بنوارە: الوحي المحمّدي: ٧١، ومباحث في علوم القرآن، منّاع القطّان: ٤٣، والنّبأ العظيم: ٣٩، والعقيدة الإسلاميّة ومذاهبها: ٤٨٧، ووحي الله: ٢١٣-٢١٧.

نکۆڵیی لیٚ دەکات بە مەحاڵی دادەنێت، ئەم دیاردە نا ئاساییانەی لەگەڵ سرووشدا ڕوو دەدەن بە خەیاڵ و خۆدوان دادەنێن[٧٤].

بێباوەڕان کە لەم گومانەدا سرووشیان کردووە بە خۆدوان، بیرۆکەیەکی زانستیی تازەیان باس کردووە لە هەمان کاتدا تازەش نییە، بەڵکو بیرێکی سەردەمی نەفامییە. پێغەمبەرەیان ﷺ بە پیاوێکی بیر فراوان و هەست قووڵ لە قەڵەم داوە، کەواتە هۆنەرە، لە سەرو ئەمەوە ویژدانێکی زۆریان داوەتیٚ کە زاڵ بێت بەسەر هەستیارەکانیدا تا وای لێدێت وا دەزانێت خەڵك دەبینێت، گوێی لە کەسێکە قسەی لەگەڵ دەکات و ئەو کەسەی دەیبینێت هیچ نییە بێجگە لە ویژدان و خەیالاتی خۆی، کەواتە ئەم حاڵەتەش دێوانەیی و خەونی بیٚ سەروبەرییە[٧٥].

وەڵاممان بۆیان: سرووش لە ریزی زیرەکی و هەستی ناوەوە و ڕێنمای دەروون و سەرناسی کە بە خەڵوەت و ڕاهێنانی رۆحی کەم و زیاد دەکات، بیرکردنەوەی دوور و درێژی بەردەوام، خۆدوان نییە کە بریتییە لە خستنە دڵێکی زیاد لە ئەنجامی ئامادەباشیی دەروونێکی بەرز و رابوردوویەکی پاك، چونکە ئەمانە زانیارییەکی تەواو و دڵنیاییەکی دوور لە گومان نابەخشن، بەڵکو لە ئاستی بابەتێکی کەسیدا دەمەنێتەوە و هیچ زانیارییەك لە سەرچاوەیەکی بەرزتر و باڵاتر وەرناگرن، خاوەنەکەی بەرز ناکاتەوە بۆ پلەی پێغەمبەرایەتی، چونکە سرووش بابەتێکی کتوپڕە و زیادە لە سروشتی مرۆڤـ کە دابەزیوەتە سەر پێغەمبەر ﷺ لە لایەن خودای پەروەردگارەوە لە ڕێی فریشتەی تایبەت بەو کارەوە[٧٦]،

پاشان بەمانە دەڵێن چ شتێك لە قورئانی پیرۆزدا لەسەر زیرەکی و هەست و هەڵێنجاندن بەندە؟

---

([٧٤]) بنوارە: الوحي المحمّدي: ٧١، ومحاضرات في علوم القرآن: ٥٠-٥١.

([٧٥]) بنوارە: مباحث في علوم القرآن، منّاع القطّان: ٤٦، ووحي الله: ٢١٣.

([٧٦]) بنوارە: مباحث في علوم القرآن، د. صبحي الصّالح: ٢٦، وأصول الدّين الإسلامي: ٢٧٠، ومحاضرات في علوم القرآن: ٥٠-٥١.

لایەنی هەواڵی کە بەشی گەورەی قورئانە، هیچ ژیرێك نكۆڵی لەوە ناكات كە تەنها لەسەر وەرگرتن بەندە، وەك ئەو هەواڵانەی كە قورئان باسی كردووە دەربارەی میللەتان و پێغەمبەرانی پێشوو بە وردی و تەواوی.

هەروەها وەك چۆن هەواڵی زۆر وردی تێدایە باس لە ژمارەی ئەندازەیی دەكات كە هیچ كەس نایزانێ بێجگە لە توێژەرێكی بە ئاگا، وەك لە باسی یارانی ئەشكەوتدا دەفەرموێت: (وَلَبِثُوا فِي كَهْفِهِمْ ثَلَاثَ مِئَةٍ سِنِينَ وَازْدَادُوا تِسْعاً) (سورة الكهف: ٢٥)، واتە: لە ئەشكەوتەكەیاندا سێ سەد ساڵ مانەوە و نۆشیان زیاد كرد، ئەمەش لای ئەهلی كیتاب سێ سەد ساڵی هەتاوییە، ئەو نۆ ساڵە جیاوازیی نێوان ساڵی هەتاوی و مانگییە.

كەواتە پێغەمبەر لە كوێوە ئەم وردەكارییە راستییەی هێنا ئەگەر سرووش نەبێت؟ لە كاتێكدا ئەو ﷺ پیاوێكی نەخوێندەوار بووە لەناو میللەتێكی نەخوێندەواری بتپەرستدا بووە. ئەو چل ساڵ پێش بوونی بە پێغەمبەر لەگەڵیاندا ژیاوە، لە كوێوە ئێستا سەری لێشێوا و گومڕا بوو؟ ئایا بە راستگۆ و متمانەدار ناویان نەناوە؟ (أَمْ لَمْ يَعْرِفُوا رَسُولَهُمْ فَهُمْ لَهُ مُنكِرُونَ) (سورة المؤمنون: ٦٩)، واتە: یان شارەزای پێغەمبەرەكەیان نین و نایناسن [٧٧].

هەروەها ئەوەی لە قورئاندا لە بیروباوەڕ باس كراوە، بریتییە لە وردەكاری و درێژەپێدانی لە سەرەتای دروستبوونی بونەوەرەوە هەتا كۆتایی و ژیانی دوایی و بەهەشت و رۆزییەكانی و دۆزەخ و ئازارەكانی، هەروەها هەرچیی پەیوەندی هەیە بەو بابەتەوە لە فریشتە و وەسفەكانیان و ئەركەكانیان، ئەمانە هەمووی چەند زانیارییەكن هیچ بوارێك بۆ زیرەكی و سەرناسی نییە ئەمانە دەرك بكات[٧٨].

---

([٧٧]) بنوارە: مباحث في علوم القرآن، د. صبحي الصّالح: ٤١، والنّبأ العظيم: ٣٩-٤٦.

([٧٨]) بنوارە: مباحث في علوم القرآن، منّاع القطّان: ٤٤، ومباحث في علوم القرآن، د. صبحي الصّالح: ٤١.

ئەگەر بە وردی چاوێك بخشێنینەوە بە چۆنێتیی سرووش و نیشانەكانیدا و ئەو گۆڕانكارییانەی روودەدەن لەسەر پێغەمبەر ﷺ، بۆمان دەردەكەوێت سرووش پەیوەندیی نییە بە ئارەزووی دەروونەوە و هەروەها ئەو تابلۆیەمان بۆ دەردەكەوێت كە پێغەمبەر ﷺ بۆ روونكردنەوەی چۆنیەتی هاتنە خوارەوەی سرووش بۆ ناو دڵی، كێشاویەتی:

كاتێك جوبرەئیل ﷺ هات بۆ لای پێغەمبەر ﷺ لە ئەشكەوتی حیڕا، فەرمانی پێكرد كە بخوێنێتەوە[٧٩]، كە ئەویش نەخوێندەوار بوو، فەرمووی: من خوێندەواریم نییە و فەرمووی ﷺ گرتمییە باوەشی و بە توندی گوشیمی هەتا زۆر ماندوو بووم، پاشان بەری دام و فەرمووی: بخوێنە. دووبارە ووتم: من خوێندەواریم نییە. بۆ جاری دووەم گرتمی و گوشیمی و زۆر ماندووی كردم و بەری دام، پاشان فەرموی: بخوێنە، وتم: من خوێندەواریم نییە. بۆ جاری سێیەم گرتمی و گوشیمی و فەرمووی: بخوێنە بە ناوی ئەو پەروەردگارەتەوە كە دروستی كردووە، مرۆڤی لە پارچە گۆشتێك دروست كردووە، بە ناوی پەروەردگارە بەخشندەكەتەوە بخوێنە.

پێغەمبەر ﷺ گەڕایەوە دڵی دەلەرزی، چووە لای خەدیجەی كچی خووەیلدی خێزانی (خودا لێی رازی بێت) فەرمووی دامپۆشن دامپۆشن، دایان پۆشی هەتا ترسەكەی لێ دووركەوتەوە، پاشان بۆ خەدیجەی گێڕایەوە و فەرمووی: بە ڕاستی ترسام لە گیانی خۆم[٨٠].

---

([٧٩]) فەرمانكردن بە خوێندنەوە فەرمانی بوونە نەك زۆرلێكردن لە كارێكدا ژوور لە دەستەڵات، واتە: ببە بە خوێنەوار، بۆیە سێهەم جار فەرمووی: (إقرأ باسم ربّك الّذي خلق)، واتە: ببە بە خوێنەوار بە ناوی خودای گەورەوە و لە ڕێی ئەوەوە و بە توانا پێدانی ئەو پێت كە خوێنەوار بیت، نەك بە هەوڵ و توانای خۆت. الوحي المحّدي: ٩٥.

([٨٠]) زانایان دوانزە رایان هەیە بۆ مەبەست لە ترسانی پێغەمبەر ﷺ وتوویانە (دێوانەبوون، ئەوەی بینوییەتی لە رەگەزی دەرك كردن بووە. وتوویانە: ترساوە كە بفەوتێ یان بمرێت. وتوویانە: نەخۆشی، یان

پێغەمبەر ﷺ ترسی خۆی دەربڕیوە لە بینینی فریشتەکە (جوبرەئیل) عليه السلام، بۆیە خەدیجەی خێزانی هۆکارێکی نەدۆزیوەتەوە پێغەمبەری پێ دڵنیا بکات و خۆی دڵنیا بێت لێی، بێجگە لە پرس و مەشورەت بە زاناترین کەسی قوڕەیش، ئەویش وەرەقەی کوڕی نەوفلی ئامۆزای بووە، کە کتێبەکانی جولەکە و گاورەکانی خوێندووەتەوە، خەدیجەی دڵنیا کرد ئەمە ئەو ناموسەیە[٨١]، کە خوای گەورە دایبەزاندووەتە سەر موسا[٨٢].

لەمەوە بۆمان دەردەکەوێت کە لە باوەش گرتنی جوبرەئیل بۆ پێغەمبەر ﷺ و گوشینی بە توندی و فەرمان پێکردنی بە خوێندنەوە سێ جار، بە دووپاتکردنەوەیەکی ئەم وەرگرتنە دەرەکییە دادەندرێت و ئەگەری ئەوە دووردەخاتەوە کە بابەتێکی دەروونی یان خەیاڵات بێت، بۆیە وایزانی کە تووشی کارێك هاتووە، بۆیە بە خێرایی چووە لای خێزانەکەی بۆ ئەوەی ئەو دەنگ و باسەی لا بگێڕێتەوە و هەندێك لە ترس و دامانی نەمێنێت. دڵی دەلەرزێت لە ترسدا، تا ئەو رادەیەی ترساوە بمرێت، لە سەختیی ئەو رووداوەی بەسەری هات، تا پێی فەرمووە: (داميۆشن، داميۆشن) و داوای داپۆشین و پێچانەوەی کردووە بۆ ئەوەی بەوە دڵنیایی بێت بۆ دڵی، بۆیە دایانپۆشی هەتا ئەو ترس و لەرزەی لێ دورکەوتەوە.

کاتێك سرووش بۆ جارێکی تر هاتە لای، پاش ماوەیەك خوای گەورە فەرمانی پێکرد (يَا أَيُّهَا الْمُدَّثِّرُ، قُمْ فَأَنذِرْ) (سورة المدثر: ١– ٢)، واتە: ئەی خۆ داپۆشیو

---

بێدەسەڵاتی بۆ هەڵگرتنی باری پێغەمبەرایەتی. غەیری ئەمانەش وتراوە. بنوارە: شرح النّووي على صحيح مسلم: ٢/٢٠٠، وفتح الباري: ١/٢٤.

([٨١]) لە زمانەوانیدا (ناموس) خاوەنی نهێنییەکی باشە، (جاسوس) سیخوڕ، خاوەنی نهێنییەکی خراپە، مەبەست لە ناموس جوبرەئیلە (سەلامی خودای لەسەر بێت). بنوارە: مشارق الأنوار: ٢/١٣.

([٨٢]) رواه البخاريّ في صحيحه: ١/٤، باب كيف كان بدء الوحي...، رقم الحديث: (٣)، من حديث عائشة.

هەستە ئاگادار بکەرەوە. پێغەمبەر ﷺ بەم فەرمانە بیری کردەوە لە کاتێکدا کە خۆی سەرسام مابوو، بە خەدیجەی فەرموو جوبرەئیل فەرمانی پێکردووم کە خەڵکی ئاگادار بکەمەوە، بانگهێشتی کێ بکەم و کێ وەڵامم دەداتەوە؟

هەموو ئەمانە بەڵگەن لەسەر ئەوەی کە سرووش بابەتێکی خودی نییە، بەڵکو لە دەرەوەی دەروونی پێغەمبەرە ﷺ و لە لایەن خوای گەورەوەیە، لە رێی فریشتە جوبرەئیلەوە عليه السلام.

وەك چۆن ئەو دیاردانەی زۆتر باسمان کرد و لەسەر پێغەمبەر ﷺ دەردەکەوتن کاتێك سرووشی بۆ دەهات، بەڵگەن لەسەر ئەوەی کە سرووش لە لایەن خۆیەوە نەبووە.

هەروەها بە ئاگایی تەواوی پێغەمبەر ﷺ ئەو لەبەرکردنە وردەی بۆ ئەو ئایەتانەی کە بۆی هاتووەتە خوار لە کاتی سرووشدا و لە پاشاندا بەڵگەن لەسەر ئەوەی کە سرووش لە دەرەوەی ویست و دەروونی خۆیەتی، چونکە خستنە دڵ و ئاشکراکردن مرۆڤ ناگەیەنێتە پلەی پێغەمبەرایەتی و سرووش، چونکە لە هەموو سرووشێکدا بە ئاگاییەك هەیە و لە هەموو پێغەمبەرایەتییەکدا هەستێك هەیە بۆ واتای پێغەمبەرایەتی و دەرك پێکردنێك هەیە بۆ هۆکارەکەی، کەس بە بێئاگایی و بێهەستی تۆمەتبار ناکرێت یەکێك نەبێت کە هەست و ئاگای لە دەست دابێت، بۆیە دەبێت زاراوەی ئاشکراکردن و کەشف و هەستی ناوەکی و بێئاگایی لە سرووش دووربخرێتەوە، چونکە سروشتی راستییە ئاینییەکان و هەواڵە پەنهانییەکان لە دیاردەی سرووشدا قەبوڵی چونە ژێر رکێفی بێهەستی ناکات(٨٣).

(٨٣) بنوارە: مباحث في علوم القرآن، د. صبحي الصّالح: ٢٦-٢٨، وأصول الدّين الإسلامي: ٢٧٧، والنّبوّة والعصر: ١٢٠-١٢١.

**هەروەها دابڕانی سرووش[٨٤]، لە پێغەمبەر ﷺ کە زۆر بە تاسەوەیە بۆی، بەڵگەیە لەسەر سەربەخۆیی سرووش لە دەروون و هزری ﷺ، بۆیە لە خودی خۆیەوە دەرنەچووە و بە پێی ویستی خۆی نەبووە، تەنها کاتێك سرووشی بۆ هاتووە کە خوای گەورە ویستی لەسەر بووبێت[٨٥].**

## داواکراوی دووەم:

## گومانی ئەوەی کە قورئانی پیرۆز دەستکردی مرۆڤە و موحەممەد ﷺ واتاکانی داهێناوە و شێوازەکەی داڕشتووە و خستویەتییە پاڵ خودای مەزن و لە لایەن سرووشەوە نەبووە، هەروەها بەرپەرچدانەوەیان

**بەمانە وەڵامی ئەمە دراوەتەوە:**

**١ـ ئەگەر پێغەمبەر ﷺ گەورەیی بۆ خۆی ویستبێت و خەڵکی دەستەوەستان بکردایە بە موعجیزە بۆ پشتگیری لە گەورەکردنی خۆی، ئەوا چ سوودێك هەبوو بۆ ئەوەی ئەو گەورەییە بداتە پاڵ خودای مەزن، لەگەڵ ئەوەدا کە دەیتوانی بیخاتە**

---

(٨٤) سرووش بۆ ماوەی سێ ساڵ یان کەمتر بچڕا، دروستتر وایە بۆ ماوەی شەش مانگ بوبێت، کە ئەمەش لە سەرەتای فەرمانی جوبرەئیل بووە بە (إقرأ) و سەرەتای سورەتی (المدثر) کە فەرمانی پێ کرا بە ئاگادارکردنەوەی خەڵکی. لەم کاتەدا پێغەمبەر ﷺ هیچ سورەتێکی بۆ خەڵك نەخوێندووەتەوە، بانگەوازی نەکردوون بۆ هیچ شتێك، قسەی بۆ خانەوادە و هاوڕێکانیشی نەکردووە دەربارەی هیچ بابەتێکی چاکسازیی ئاینی، وریای نەکردوونەتەوە لە خورافاتی هاوەڵپەیداکردن و گومڕایی، کە خۆی زۆر پێی دڵتەنگ بووە. ئەگەر شتێکی لەو کاتەدا باس بکردایە ئەوا لێیان دەگێڕایەوە، نەخوازەڵا دایکی ئیمانداران خەدیجە و عەلیی ئامۆزای و زەیدی کوڕی حاریسە و ئەبوبەکری صدیق کە بە درێژایی تەمەنی لەگەڵیدا ژیاوە، بۆیە ئەم بێدەنگییە خۆی بەڵگەیەکی تەواوە لەسەر بنەبڕکردنی ئەگەری ئەوەی کە سرووش خۆدوان بێت. بنواڕە: الوحي المحمّدي: ١٠٧، ومباحث في علوم القرآن، د. صبحي الصّالح: ٣٦-٣٧.

(٨٥) بنواڕە: العقيدة الإسلاميّة ومذاهبها: ٤٩٤.

پاڵ خۆی، ئەمە بەس دەبوو بۆ بەرزکردنەوەی شان و شەوکەتی خۆی، لە کاتێدا کە هەموو عەرەب بە ڕەوانیی زوبانیان دەستەوەستان مان لە دژایەتی کردن و ڕەخنەگرتن لەو قورئانەی کە بۆی هاتبوو[٨٦].

٢ـ بوونی ڕاستییە زانستییەکان لە ئایەتەکانی قورئانی پیرۆزدا لە ئاستی پزیشکی و ئەستێرەناسی و زیندەوەرزانی و جیۆلۆجیدا، کە پێغەمبەر ﷺ و خەڵکی ئەو ناوچەیە بێئاگابوون لەو ڕاستییە زانستییانە، هەروەها ئەو ڕاستییانەی پەیوەندییان بە دروستبوونی مرۆڤ و ژیانی دونیا و ئەو دونیا و زیندوبوونەوە و سزا و پاداشتەوە هەیە[٨٧].

٣ـ جیاوازیی شێوازی قورئانی پیرۆز لەگەڵ شێوازی هەموو مرۆڤ و هەروەها تەنانەت لەگەڵ شێوازی فەرمودەی خودی پێغەمبەر ﷺ، جیاوازییەکی یەکجار زۆر و گشتگیر لە ئیعجاز و ڕەوانبێژی و دارِشتنیدا، لەگەڵ ئەوەدا کە فەرمودەی پێغەمبەر ﷺ چ ڕەوانییەکی تێدایە.

٤ـ ئەو بەڵگە مێژوویيانەی دووپاتی ئەوە دەکەنەوە کە قورئان لە لایەن خودای گەورەوە هاتووەتە خوار و گەیشتووەتە لامان بە شێوەی گومانبڕ (متەواتر)، ئەمەش ڕاستییە و پشتگیری دەکات لەوەی کە قورئانی پیرۆز دەقێکی خوداییە و دەستی مرۆڤی تێدا نییە.

٥ـ پێغەمبەر ﷺ بە دانپێدانانی ڕۆژهەڵاتناسان نەخوێندەوار بووە، نە نووسیویەتی و نە خوێندویەتییەوە، لاڤی ئەوەشی لێ نەداوە کە ئەم پەرتووکە خۆی نووسیویەتی.

٦ـ هەروەها بۆنەی دابەزینی ئایەتەکانی قورئان بەڵگەن لەسەر ئەوەی کە قورئان لە لایەن خواوەیە، چونکە کۆمەڵگەی ئیسلامی لەو کاتەدا بە موسڵمان و

---

([٨٦]) بنوارە: مباحث في علوم القرآن، منّاع القطّان: ٤٠-٤١، ومحاضرات في علوم القرآن: ٤٩.

([٨٧]) بنوارە: لا يأتون بمثله: ٢٠٥.

غەیرە موسڵمانەوە پرسیاریان لە پێغەمبەر ﷺ دەکرد و پێغەمبەر ﷺ چاوەڕێی وەڵامی سرووش دەبوو بۆ یاسا ئیسلامییەکان، وەك هاوەڵان بۆیان گێڕاوینەتەوە[٨٨].

٧ـ بەڵگەیەکی تر لەسەر راستیی قورئان ئەوەیە کە دووڕووەکان، دایکی ئیمانداران، عائیشەیان تاوانبار کرد (رووداوی ئیفك) و عائیشە خۆشەویسترین خێزانی بوو بۆی و ئەم تاوانە پەیوەندیی بە شەرەف و ناموسەوە هەیە، لەم بابەتەدا سرووش درەنگ کەوت و پێغەمبەر ﷺ نیگەران بوو و هاوەڵانیشی هەروەها نیگەران بوون، تا رادەیەکی زۆر بێزار بوون و کۆششی زۆری کرد ﷺ و راوێژی زۆری کرد لەم بابەتەدا، مانگێکی تەواو تێپەڕی تەنها ئەو ئەوەی فەرموو بوو بە عائیشە (ئەی عائشە بابەتێك بەم شێوەیە بە من گەیشتووە، ئەگەر پاك بیت خوای گەورە پاکیت دەردەخات و ئەگەر تاوانباریت داوای لێخۆشبوون لە خودا بکە)[٨٩]، بەم شێوەیە کێشەکە مایەوە هەتا سرووش هات و بە ئایەتی قورئان پاکیی حەزرەتی عائیشە دەرکەوت[٩٠]، چ رێگرێك هەبوو، ئەگەر قورئان وتەی خۆی بوایە، کە هەر لە سەرەتاوە پاکیی عائیشە بە دەربخات و شەرەفی خۆی بپارێزێت، بەرامبەر بێ دەنگ بکات، بەڵام ئەمە رەوشتی پێغەمبەر نییە ﷺ کە درۆ لە خەڵکی دووردەخاتەوە، خۆی درۆ بە ناوی خوای گەورەوە بکات، لەگەڵ ئەوەدا کە ئەم مانگە بە قەدەر چەندساڵێك ناڕەحەت بووە لەسەری[٩١].

---

(٨٨) بنوارە: مدخل إلى الثّقافة الإسلاميّة: ١٥٥.

(٨٩) جزء من حديث رواه البخاريّ في صحيحه: ٢/٩٤٥، كتاب الشّهادات، باب تعديل النّساء بعضهنّ بعضاً، رقم الحديث: (٢٥١٨)، من حديث عائشة.

(٩٠) بنوارە: مباحث إلى علوم القرآن، منّاع القطّان: ٤٣، والنّبأ العظيم: ٢٠-٢٣.

(٩١) بنوارە: مباحث إلى علوم القرآن، منّاع القطّان: ٤٣، ومباحث في علوم القرآن، د. صبحي الصّالح: ٣٧، والنّبأ العظيم: ٢٠-٢٤، والنّبوّة والعصر: ١٠٩-١١٠.

٨ـ درەنگکەوتنی سرووش بۆ سەر پێغەمبەر ﷺ لە زۆر کاتدا، سەرەڕای پێویستیی زۆری پێی و ئەگەر لە لایەن خۆیەوە بوایە درەنگی نەدەخست لە هیچ لەم کاتە هەستیارانەدا، ئەمەش بەڵگەیە لەسەر ئەوەی کە دەستی خۆی تێدا نییە.

٩ـ لۆمەی توندی خوای گەورە بۆ پێغەمبەر ﷺ لە قورئانی پیرۆزدا لە هەندێك هەڵوێستیدا، بەڵگەیە لەسەر ئەوەی قورئان لە لایەن خواوەیە، وەك:

أـ لۆمەکردنی لەسەر رازیبوونی بە بەردانی دیلەکانی جەنگی بەدر، خوای گەورە دەفەرموێت: (مَا كَانَ لِنَبِيٍّ أَن يَكُونَ لَهُ أَسْرَى حَتَّى يُثْخِنَ فِي الأَرْضِ تُرِيدُونَ عَرَضَ الدُّنْيَا وَاللّهُ يُرِيدُ الآخِرَةَ وَاللّهُ عَزِيزٌ حَكِيمٌ، لَّوْلاَ كِتَابٌ مِّنَ اللّهِ سَبَقَ لَمَسَّكُمْ فِيمَا أَخَذْتُمْ عَذَابٌ عَظِيمٌ) (سورة الأنفال: ٦٧– ٦٨)، واتە: بۆ هیچ پێغەمبەرێك نەبووە کە دیلی هەبێت، هەتا کاتێك چاك پایەدار و جێگیر دەبێت لەزەویدا، کەلوپەل و شتومەکی دونیاتان دەوێت؟ لەکاتێکدا خوا ئەو جیهانی دەوێت و قیامەتی مەبەستە، خواش تەواو باڵادەست و دانایە. خۆئەگەر بڕیارێك لەلایەن خواوە پێشنەکەوتایە لەسەر ئەو شتانەی کە وەرتانگرت، سزایەکی زۆر گەورەتان تووش دەبوو.

ب ـ لۆمەکردنی کاتێك کە پشتی هەڵکرد لە عەبدوڵڵای کوڕی ئوم مەکتومی نابینا و گرنگیدانی بە گەورەیەکی قوڕەیش لە بانگهێشتکردنیدا بۆ ئیسلام، خوای گەورە دەفەرموێت: (عَبَسَ وَتَوَلَّى، أَن جَاءهُ الْأَعْمَى، وَمَا يُدْرِيكَ لَعَلَّهُ يَزَّكَّى، أَوْ يَذَّكَّرُ فَتَنفَعَهُ الذِّكْرَى، أَمَّا مَنِ اسْتَغْنَى، فَأَنتَ لَهُ تَصَدَّى، وَمَا عَلَيْكَ أَلَّا يَزَّكَّى، وَأَمَّا مَن جَاءكَ يَسْعَى، وَهُوَ يَخْشَى، فَأَنتَ عَنْهُ تَلَهَّى، كَلَّا إِنَّهَا تَذْكِرَةٌ) (عبس: ١– ١١)[٩٢]، واتە: رووی گرژ کرد و پشتی هەڵکرد، کاتێك کە نابیناکە هاتە لای...

---

([٩٢]) بنواڕە: مباحث في علوم القرآن، د. صبحي الصّالح: ٣٠-٣١، وعتاب الرّسول في القرآن تحليل وتوجيه: ١٥١، والنّبأ العظيم: ٢٤-٢٨، والنّبوّة والعصر: ١٠٧-١٠٨.

ت ـ هەروەها دەرخستنی قورئان بۆ هەندێك لەو بابەتانەی پێغەمبەر ﷺ لە دەروونیدا شاردویەتیەوە[٩٣]، کە ستەمە لەسەر کەسێکی ژیری تەندروست وا بیٚ بە خەیاڵیدا کە پێغەمبەر ﷺ ڕوو بکاتە خۆی و قسە بکات و شت بخاتەوە یادی خۆی، یاخود خۆی ئاگادار بکاتەوە و لۆمەی خۆی بکات، یان شتێك دەربخات کە خۆی حەز ناکات دەربکەوێت، ئەوە بە خەڵکی رابگەیەنێت کە ئەمە قورئانە و گۆڕان و کەم و زیادی بەسەردا نایەت و لە بیر ناکرێتەوە، بەڵکو ئەوە بەڵگەیەکی روونە لە لایەن خواوەیە و لەگەڵ پێغەمبەردا دواوە، پێغەمبەرێك کە چۆن پەیامەکەی بەدەست گەیشتووە ئاوەهاش گەیاندویەتی (درودی خوای لەسەر بێت).

١٠ـ هەروەها هەڵسوکەوتی ژیانی پێغەمبەر و ئاکاری لەناو هۆزەکەیدا، کە ناسراو بووە بە رەوشتی بەرزی و سیفاتی جوانی و بە راستگۆیی، وەك چۆن هۆزەکەی شایەتیی ئەمەیان بۆ داوە، ئەستەمە خاوەنی ئەم هەمووە سیفەتە بەرزە راست نەکات، بانگەشەی ئەوە بکات کە ئەو قورئانە خۆی داینەناوە (وَإِذَا تُتْلَى عَلَيْهِمْ آيَاتُنَا بَيِّنَاتٍ قَالَ الَّذِينَ لاَ يَرْجُونَ لِقَاءنَا ائْتِ بِقُرْآنٍ غَيْرِ هَـذَا أَوْ بَدِّلْهُ قُلْ مَا يَكُونُ لِي أَنْ أُبَدِّلَهُ مِن تِلْقَاء نَفْسِي إِنْ أَتَّبِعُ إِلاَّ مَا يُوحَى إِلَيَّ إِنِّي أَخَافُ إِنْ عَصَيْتُ رَبِّي عَذَابَ يَوْمٍ عَظِيمٍ) (يونس: ١٥)، [٩٤] ئەگەر ئایەتە روونەکانی ئێمەیان بۆ بخوێنرێتەوە، ئەوانەی تەمەننا ناکەن پێمان بگەن، دەڵێن قورئانێکی تر بهێنە یان ئەمە بگۆڕە، ئەی موحەممەد تۆش بڵیٚ من بۆم نییە لە خۆمەوە دەستکاریی بکەم، تەنها دوای ئەوە کەوتووم کە سرووشم بۆ بێت...

---

([٩٣]) قال تعالى: (إِذْ تَقُولُ لِلَّذِي أَنْعَمَ اللَّهُ عَلَيْهِ وَأَنْعَمْتَ عَلَيْهِ أَمْسِكْ عَلَيْكَ زَوْجَكَ وَاتَّقِ اللَّهَ وَتُخْفِي فِي نَفْسِكَ مَا اللَّهُ مُبْدِيهِ وَتَخْشَى النَّاسَ وَاللَّهُ أَحَقُّ أَنْ تَخْشَاهُ فَلَمَّا قَضَى زَيْدٌ مِنْهَا وَطَرًا زَوَّجْنَاكَهَا لِكَيْ لا يَكُونَ عَلَى الْمُؤْمِنِينَ حَرَجٌ فِي أَزْوَاجِ أَدْعِيَائِهِمْ إِذَا قَضَوْا مِنْهُنَّ وَطَرًا وَكَانَ أَمْرُ اللَّهِ مَفْعُولاً) سورة الأحزاب: الآية: (٣٧).

([٩٤]) بنواڕە: مباحث إلى علوم القرآن: ٤٢-٤٣، ومحاضرات في علوم القرآن: ٥٠.

١١ـ حاشاکردنی پێغەمبەر ﷺ لە زانینی پەنهان و دابەزینی قورئان هەندێك جار بە پێچەوانەی ویستی بڕیاری ئەوەوە بووە، بەڵگەیە لەسەر سەربەخۆیی قورئان وەك لەم خاڵانەدا دەردەکەوێت: 

أـ بە فەرمانی خودا حاشای کردووە لە زانینی پەنهان بێجگە لەوەی کە بە سرووش دەیزانێ. خوای گەورە دەفەرموێت: (قُلْ لا أَقُولُ لَكُمْ عِنْدِي خَزَائِنُ اللَّهِ وَلا أَعْلَمُ الْغَيْبَ وَلا أَقُولُ لَكُمْ إِنِّي مَلَكٌ إِنْ أَتَّبِعُ إِلاَّ مَا يُوحَى إِلَيَّ قُلْ هَلْ يَسْتَوِي الأَعْمَى وَالْبَصِيرُ أَفَلا تَتَفَكَّرُونَ﴾ (الأنعام: ٥٠)، ئەی موحەممەد بڵێ من ناڵێم گەنجینەی خوام لە لایە، پەنهان نازانم و ناڵێم من فریشتەم، تەنها شوێن سرووش دەکەوم... 

ب ـ ڕاڤەکردنی هەندێ ئایەتی بە ئیجتیهادی خۆی و هەتا دابەزینی سرووش بە پێچەوانەی بڕیارەکەیەوە، پێغەمبەر ﷺ ئەگەر سەرپشك بکرایە لە بەینی دوو کاردا، ئاسانترینیانی هەڵدەبژارد کە بەزەیی تێدا بێت بۆ کەسی و هیدایەتی تێدا بێت بۆ هۆزەکەی، بە دۆست کردنی تێدا بێت بۆ دوژمنەکەی و ئەوەش پێچەوانە نەبووە، بەڵکو هەڵبژاردنێك بووە لە دوان، کە لە لای خودا دووەمیان دانایی زیاتری تێدا بووە، وەك هەڵوێستی لە نوێژی مردوو لەسەر عەبدوڵڵای کوڕی ئوبەی، گەورەی دووڕووەکان، کاتێك عومەری کوڕی خەتاب ﷺ هاتەوە لای پێغەمبەر ﷺ پێی فەرموو: ئایا نوێژی لەسەر دەکەی؟ کاتێك خوای گەورە ڕێی نەداوە بەوە. پێغەمبەر ﷺ فەرمووی خوای گەورە سەرپشکی کردووم، فەرموویەتی (اسْتَغْفِرْ لَهُمْ أَوْلا تَسْتَغْفِرْ لَهُمْ إِنْ تَسْتَغْفِرْ لَهُمْ سَبْعِينَ مَرَّةً فَلَنْ يَغْفِرَ اللَّهُ لَهُم) (سورة التوبة: ٨٠)، واتە: داوای لێخۆشبوونیان بۆ بکە یان بۆ مەکە، ئەگەر حەفتا جار داوای لێخۆشبوونیان بۆ بکەی خوا لێیان خۆش نابێت، پێغەمبەر ﷺ فەرموی لە حەفتاش زیادی دەکەم و نوێژی لەسەر کرد. پاشان سرووش هاتە خوارەوە (لا تُصَلِّ عَلَى أَحَدٍ مِنْهُمْ مَاتَ أَبَدًا وَلا تَقُمْ عَلَى قَبْرِهِ) (سورة التوبة: ٨٤)،

واتە: قەد نوێژ لەسەر هیچ کەسێکیان مەکە، واتە (دووڕووەکان)، لەسەر قەبرەکەی رامەوەستە، پاش ئەوە وازی لە نوێژکردن هێنا لەسەریان[٩٥]،[٩٦].

## داواکراوی سێیەم:

## گومانی ئەوەی پێغەمبەر ﷺ قورئانی وەرگرتبێت لە مامۆستایەکی مرۆڤـ و وەڵامدانەوەی

گرووپێك لە هاوبەش پەیداکەرانی قوڕەیش سرووشیان بە کارێکی بەدەر لە موحەممەد ﷺ دانا، وایان دانا کە کەسێکی تر پێغەمبەری فێری قورئان کردووە، بەمە خەتیان کێشا بۆ بێدینە بەناو رۆشنبیرەکانی دوای خۆیان، بۆ ئەوەی خەڵکی چەواشە بکەن. کۆمەڵێکیان وتیان کە راهیبێك بە ناوی (بوحەیرا) لە شوێنکەوتووانی (ئاریۆس) لە یەکتاپەرستیدا بووە و هەندێکی تریان وتیان (وەرەقەی کوڕی نەوفەل)[٩٧]، وەك چۆن لەمانەدا بۆمان دەردەکەوێت.

رۆژهەڵاتناسان وتوویانە کە پێغەمبەر ﷺ لەژێر کاریگەریی راهیبێکی گاوردا بووە کە ناوی (بوحەیرا) بووە، لە کاتی گەشتەکەیدا بۆ شام لە شاری (بوصرا)، قورئان لەوەوە فێربووە[٩٨].

---

(٩٥) رواه البخاريّ في صحيحه: ١٧١٦/٤، باب: (ولا تصلّ على أحد..)، رقم الحديث: (٤٣٩٥)، من حديث ابن عمر.

(٩٦) بنوارە: النّبأ العظيم: ٢٨-٢٩.

(٩٧) بنوارە: مناهل العرفان في علوم القرآن: ٤٢-٤٤، والعقيدة الإسلاميّة ومذاهبها: ٥٠٣، وأصول الدّين الإسلامي: ٢٩٢.

(٩٨) بنوارە: وحي الله: ١٦١.

وتوویانە: ئەم راهیبە بیروباوەڕی (نەستۆری) بووە، دژی لاهوتیی مەسیح و باوەڕی سێ کوچکەیی بووە، زانایەکی ئەستێرەناس بووە و بیرزانێکی جادووگەر بووە[٩٩].

وەڵامی ئەمانە بەمە دەدرێتەوە: بۆچی بوحەیرای راهیب پێغەمبەرایەتیی بۆ خۆی نەویست ئەگەر تا ئەم رادەیە پلەی بەرز بووە و زانیاریی ئاینیی زۆر بووە؟

پاشان ئەم بانگهێشتە دوورە لە ژیری و راستییەوە، چونکە ئەگەر گریمان بوحەیرا قورئانی لەناو دڵدا بوایە و کە گەیشت بە منداڵێکی عەرەبی نەخوێنەوار، نە بنووسێ و نە بخوێنێتەوە، گەیشتنێکی بە سەرپێی و بێ مانەوە و لەو ماوە کورتەدا قورئانی فێر کردووە و پاش بیست و پێنج ساڵ لەم رووداوە ئەو منداڵە ئاشکرای دەکات کە ئەمە پێغەمبەرێکی نێردراوە! ئەمە چۆن ئەقڵ وەریدەگرێت، چونکە مێژوونووسان دەڵێن پێغەمبەر ﷺ نۆ ساڵ بووە یان دوازدە ساڵ بووە کە لەگەڵ ئەبو تالیبی مامیدا چووە بۆ شام و ئەم راهیبەی پشاندا لەگەڵ قورەیشدا، هەورێکی بینی بوو، بوو بە سێبەر بۆی و ئەو راهیبە بە مامی وت: کە موحەممەد لە داهاتوودا پلە و پایەکی دەبێت، وریای کردنەوە لە جولەکە، سەرەڕای ئەوەی کە ئەم بینینە بە نهێنیش نەبووە[١٠٠]، [١٠١].

---

([٩٩]) بنواڕە: الوحي المحّدي: ٧٩، والعقيدة الإسلاميّة ومذاهبها: ٥٠٥.

([١٠٠]) چەند ریوایەتێك هەیە لە هەمان بابەتدا و ئیسنادی هەمووی لاوازە، بێجگە لە ریوایەتی ترمزی، ئەوش ناوی بوحەیرای تێدا نییە و غەڵەتێکی لە دەقەکەدا تێدایە. بنواڕە: سنن التّرمذي: ٥٩٠/٥، كتاب المناقب، باب ما جاء في بدء نبوّة النّبيّ -صلّى الله عليه وسلّم-، رقم الحديث: (٣٦٢٠)، وليس في شيء من تلك الرّوايات أنّه -صلّى الله عليه وسلَّم- سمع من بحيرا شيئاً من عقيدته أو دينه. بنواڕە: دلائل النّبوّة: ٤٦/١، وأعلام النّبوّة: ٢٣٢/١، والسّيرة الحلبيّة: ١٩٢/١-١٩٣، والوحي المحّدي: ٧٩، ووحي الله: ١٦١.

([١٠١]) بنواڕە: دلائل النّبوّة: ٤٦/١، وأعلام النّبوّة: ٢٣٢/١، والسّيرة الحلبيّة: ١٩٢/١-١٩٣، والوحي المحّدي: ٧٩، ومباحث في علوم القرآن، د. صبحي الصّالح: ٤٥.

پاشان ئەگەر ئەوەی باسیان کردووە رووی بدابایە، ئەوا دوژمنانی ئەو بە بەڵگەیان دەهێنایەوە کە گوایە ئەوەی بانگەشەی بۆ دەکات لە سرووش ئەوا لە شام فێری بووە لە لایەن گاورەکانەوە، چونکە دوژمنانی لەو سەردەمەدا بەهانەی لەوە بێهێزتریان بەدەستەوە بوو، وەك چۆن قورئانی پیرۆز قسەیان دەگێڕێتەوە کە ئەوان پێغەمبەر ﷺ تاوانبار دەکەن بەوەی لە حەدادی رۆمییەوە فێری قورئان بووە، کە گاورێکی بیانییە، ئەوەی کە لە مەککە شمشێری دروست کردووە. پێغەمبەر ﷺ جارجار لە لای وەستاوە کە فێری کارەکەی ببێت، بێباوەڕان ئەم هەلەیان قۆستەوە کە بیکەن بە مامۆستایەکی زانستیی گرنگ بۆ پێغەمبەر ﷺ، قورئان بەرپەرچی دانەوە بە بەڵگەیەکی ئاسایی و روون، وەك دەفەرموێت: (وَلَقَدْ نَعْلَمُ أَنَّهُمْ يَقُولُونَ إِنَّمَا يُعَلِّمُهُ بَشَرٌ لِّسَانُ الَّذِي يُلْحِدُونَ إِلَيْهِ أَعْجَمِيٌّ وَهَـذَا لِسَانٌ عَرَبِيٌّ مُّبِينٌ) (النحل: ١٠٣)، واتە: ئێمە بە دڵنیاییەوە دەزانین کە بێباوەڕان دەڵێن مرۆڤێك موحەممەد فێر دەکات، ئەو کەسەی ئەوان باسی دەکەن بیانییە، بەڵام قورئان زمانێکی عەرەبیی پاراوە.

ئەقڵ چۆن قبوڵ دەکات ئەم هەموو زانستە قورئانییە لە لایەن کەسێکەوە دەرچووبێت کە خەڵکی مەککە بە زانایەکی بلیمەت و شارەزا لە هەموو بوارێکدا نەیناسن؟! بەڵکو نەخوێندەوارێك بووە تەنها بە چەکوشەکەی دەستی ناسراوە، زمانێکی عەرەبیی پاراوی نەبووە، چۆن ئەم کابرا بیانییە دەسکاریکراوەکانی ئاینی موسا و عیسای دۆزییەوە و راستی کردەوە؟ گومڕایی هاوبەشکارانی راست کردەوە! زانیاریی پێش تەدوینی مرۆڤی باس کرد بە چەندەها سەدە![١٠٢].

پاشان ئەگەر ئەم راهیبە یان هەرکەسێکی تر، سرووشیان بۆ پێغەمبەر ﷺ کردبێت، ئەوە بۆچی نموونەیەکی تری ئەم قورئانە ناهێنن، یان هەر نەبێت

(١٠٢) بنواڕە: مباحث في علوم القرآن، منّاع القطّان: ٤٧-٤٨، ومباحث في علوم القرآن، د. صبحي الصّالح: ٤٤، والنّبوّة والعصر: ١٣-١٥.

نموونەی کورتترین سورەتی ئەم قورئانە، وەك چۆن قورئان داوایان لێ دەکات، ئەوان خاوەنی ڕەوانترین زاری عەرەبین؟![103].

هەروەها ئەو زانیارییانەی قورئان زۆر لە مێشکی بوحەیرا و کەسانی تریش فراوانترن، بەڵکو هەموو گاور و جولەکەی ئەو کاتە و ئێستەی شام و هەموو دنیا، هەروەها عەرەبە دەشتەکییەکانی سەردەمی پێغەمبەر ﷺ کە ئەو بەلایاندا چووە لە گەشتیدا بۆ شام. هەروەها زۆر بابەتی قورئان بە پێچەوانەی بیروباوەڕی هەموویانەوە بووە[104].

پاشان هەندێك دەقی ئاشکرا هەیە کە پێغەمبەر ﷺ ئاگای لە بەسەرهات و مێژووی ژیانی پێغەمبەرانی پێش خۆی نەبووە پێش سەردەمی سرووش، هەروەها بێباوەڕانیش لەگەڵماندا یەکن کە پێغەمبەر ﷺ درۆی نەکردووە بۆ هیچ کەس و بەناوی هیچ کەسەوە، ئیتر چۆن بەناوی خودای گەورەوە درۆ دەکات، گەورەترین دوژمنی شایەتیی لەسەر ئەمە داوە، ڕەواترین شایەتی، شایەتیی دوژمنە.

هەندێك زانیاری لە قورئاندا هەبووە هیچ کەس لە ئەهلی کیتاب نەیانزانیوە، وەك چیرۆکی لەدایکبونی مەریەمی عەزرا و دابینکردنی ژیانی لەلایەن زەکەریاوە عليه السلام، وەك دەفەرموێت: (ذَلِكَ مِنْ أَنبَاء الْغَيْبِ نُوحِيهِ إِلَيكَ وَمَا كُنتَ لَدَيْهِمْ إِذْ يُلْقُون أَقْلاَمَهُمْ أَيُّهُمْ يَكْفُلُ مَرْيَمَ وَمَا كُنتَ لَدَيْهِمْ إِذْ يَخْتَصِمُونَ) (سورة آل عمران: ٤٤)[105]، واتە: ئەمە لە هەواڵە پەنهانییەکانە بۆتی سرووش دەکەین، خۆ تۆ لەوێ نەبویت کە پێنووس یان توڵەکانیان هەڵدەدایە ئاوەوە بۆ ئەوەی ساغببێتەوە کێ بەخێوکەری مەریەم دەبێت، تۆ لەوێ نەبویت کە دەمەقاڵەیان بوو لەسەر ئەو بابەتە.

---

(١٠٣) بنواڕە: الوحي المحمّدي: ١٠٤، ومدخل إلى الثّقافة الإسلاميّة: ١٥٥.

(١٠٤) بنواڕە: الوحي المحمّدي: ١٠٨.

(١٠٥) بنواڕە: الوحي المحمّدي: ١٠٤-١٠٥.

## داواكراوی چوارەم:

## لاف و گومانی ئەوەی لە وەرەقەی كوڕی نەوفەلی وەرگرتبێت.

وتوویانە: وەرەقە خزمێكی خەدیجەی خێزانی پێغەمبەر ﷺ بووە، لە عەرەبە گاورەكان بووە، پێغەمبەر ﷺ قورئانی لەوەوە وەرگرتووە(١٠٦)!

وەڵام: ئەوەی بە دروستی لەو باسەدا گێڕدرابێتەوە، فەرموودەكەی بوخاری و موسلیمە(١٠٧)، كە خەدیجە پێغەمبەری بردووەتە لای وەرەقە پاش ئەوەی پێغەمبەر ﷺ هەواڵی بەسەرهاتی ئەشكەوتی حیڕای بۆ خەدیجە باس كرد، هەمان باسی بۆ وەرەقە گێڕایەوە، لەو كاتەدا وەرەقە لە پیریدا بووە و نابینا بووە، كەمێك پاش ئەو بەسەرهاتە گیانی سپارد، مێژوو باسی ئەوەی نەكردووە كە پێش ئەوە پێغەمبەر ﷺ وەرەقەی بینیبێت، هەروەها لەم بینینەدا بە نهێنی یەكتریان نەبینیوە، بەڵكو خەدیجە ئاگاداری سەرەتا و كۆتایی ئەو بینینە بووە(١٠٨).

---

(١٠٦) بنوارە: فتح الباري: ٢٥/١، والنّبأ العظيم: ٦٩، ووحي الله: ١٤١.

(١٠٧) رواه البخاريّ في صحيحه: ٤/١، باب كيف كان بدء الوحي إلى رسول الله –صلّى الله عليه وسلّم-، رقم الحديث: (٣)، ومسلم في صحيحه: ١٤١/١، باب بدء الوحي إلى رسول الله، رقم الحديث: (١٦٠)، من حديث عائشة.

(١٠٨) بنوارە: النّبأ العظيم: ٦٩، وأصول الدّين الإسلامي: ٢٩٦، والوحي المحمّدي: ٧٩، ومباحث في علوم القرآن، د. صبحي الصّالح: ٤٥، ووحي الله: ١٤٧-١٤٨.

# کۆتایی و ئەنجام

لە کۆتاییدا ئەم توێژینەوەیە بە چەند ئەنجامێکمان دەگەیەنێت، گرنگترینیان:

١- وشەی سرووش (الوحي) وشەیەکی عەرەبیی رەسەنە، بە چەند واتایەك هاتووە، لەوانە: هێمایەکی بە پەلە، نامە، خستنەدڵێکی فیتری، چرپاندن بە گوێدا، دڵەڕاوکە، فەرمان، هەموو ئەم واتایانە بە دەوری ئەو زانستە خێرایە بێدەنگەدا دەخولێنەوە بە هەر هۆکارێك بێت، ئەم واتا زمانەوانییە لەگەڵ واتا زاراوەییەکەی (الوحي)دا یەك دەگرێتەوە، کە گەیاندنی هەر شتێکە بە نهێنی، لە لایەن خودای گەورەوە بۆ هەڵبژێردراوێك لە بەندەکانی خۆی.□

٢- خودی سرووش لە بابەتە پەنهانییەکانە کە ژیریی مرۆڤ دەرکی تەواوی پێ ناکات، شێوازی زۆری هەبووە، ئەوانەش: ئەو سرووشەی لە ڕێگەی خستنە دڵەوە بووە لە بە ئاگاییدا، خەوی ڕاست، بەرگوێکەوتنی قسەی خودایی لە بەئاگاییدا، ئەوەی لە ڕێی فریشتە (جوبرەئیل)ەوە بووە.□

٣- هەموو قورئانی پیرۆز لە ڕێی جوبرەئیلەوە گەیشتووەتە پێغەمبەر ﷺ و بەوەش دەوترێت: (سرووشی ئاشکرا). بۆ هاتنەخوارەکەی شێوازی جیاجیا هەبووە، لەوانەش، هاتنی بۆ سەر پێغەمبەر ﷺ لەسەر شێوەی فریشتەیی خۆی، یان لەسەر شێوەی پیاوێکی ناسراو بە پێغەمبەر ﷺ، تەنها خۆی بینیویەتی، یان لەسەر شێوەی پیاوێکی ناسراو لای پێغەمبەر ﷺ و هاوەڵانی، یان نەناسراو. جار بووە ئامادەبووانی کۆڕی سرووش بینیویانە و گوێیان لێ بووە و ئاگایان لە هاتنی بووە. جار بووە کەس نەیبینیوە، بەڵام کاریگەریی سرووش لەسەر ڕووی پێغەمبەر ﷺ دەرکەوتووە، لە باری مرۆڤایەتی ئاسایی خۆی داماڵراوە، ئەمەش ستەمترین باری سرووش بووە لەسەری ﷺ.□

٤- چەند دیاردەیەك هەبووە لە پێغەمبەر ﷺ ڕووی داوە لە کاتی هاتنی سرووشدا، ڕێگرە کە سرووش خۆدوانێکی دەروونی بێت، وەك: تکانی ئارەق لە

ناوچەوانی پیرۆزی لە ڕۆژی زۆر سارددا، گۆڕانی ڕەنگی جەستەی، چونکە خۆدوان هیچ لەم دیاردانەی لەگەڵ نییە.

٥- زۆر بابەتی ژیری و زانستی هەیە لەسەر دەستی سرووشتییەکان ڕوویداوە، بەڵگەن لەسەر بوونی سرووش و ڕوودانی، وەك خەواندنی موگناتیسی، کە بەڵگەیە لەسەر ئەوەی مرۆڤ ژیریی ناوەوەی هەیە، کە بەهێزترە لە ژیری دەرەوەی، لە کاتی خەواندندا لە پشت پەردەوە دەخوێنێتەوە، نموونەی تر، وەك ئامێری مۆبایل، بێتەل و رادیۆ و دەفری لێزەری.

٦- بێباوەڕان لە سەردەمی ئەم پەیامەوە هەتا ئێستا، هەستاون بە تانەدان لە قورئان کە سەرچاوەیەکی خودایيە، ئەویش لە ڕێی ورووژاندنی گومان دەربارەی سرووش، ئەوانەش گومانی زۆر لاوازن بەرامبەر بەڵگە ژیری و زانستییەکان.

٧- رۆژهەڵاتناسان قورئانیان بە خۆدوان داناوە، کە لەلایەن دەروونی پێغەمبەرەوە ﷺ هەڵقوڵاوە، وەڵامدراونەتەوە بەوەی خۆدوان زانیاری و دڵنیایی تەواو و گومانبڕ بەرهەم ناهێنێت، وەك ئەوەی لە سرووشدا هەیە.

٨- هەندێکی تر لە ڕۆژهەڵاتناس قورئانیان بە دەستکردی مرۆڤ داناوە، کە گوایە واتا و داڕشتنی پێغەمبەر ﷺ خۆیەتی و خستویەتیە پاڵ خودا، وەڵامیان دراوەتەوە کە چ سودێکی پێ دەگات بیخاتە پاڵ کەسێکی تر؟! سەرەڕای ئەوەی راستییە گەردوونی و پزیشکی و مێژووییەکانی ناوی بەڵگەن لەسەر سەرچاوە خودایيەکەی قورئانی پیرۆز.

٩- هەروەها بۆنەی دابەزینی ئایەتەکان و درەنگکەوتنی سرووش لە هەندێك باردا، لەگەڵ پێویستیی زۆر پێی. هەروەها گلەیی قورئان لە پێغەمبەر ﷺ بەڵگەیە لەسەر سەربەخۆیی سرووش.

١٠- گرۆهێکی تر لە رۆژهەڵاتناسان دەڵێن: پێغەمبەر ﷺ قورئانی لە مرۆڤێکی ترەوە وەرگرتووە، وەك بوحەیرای راهیب، یان وەرەقەی کوڕی نەوفەل، یاخود

حەددادی رۆمی کە لە مەککە بووە، وەڵامیان دراوەتەوە بە نادروستیی ئەم قسانە بە بەڵگەی مێژوویی و زانستی و ژیری، زانستی ئەمانە لە پلەیەکدا نەبووە کە وتەی وەك قورئانی پیرۆز دابڕێژن، ئەگەر وەها بن بۆچی دەیخەنە پاڵ کەسێکی تر و ناوی خۆیانی تێدا نابێت؟

لە کۆتاییدا داواکارم لە خودای باڵادەست و بەتوانا کە بمگێڕێت بە خزمەتکارێکی قورئانی پیرۆز، یارمەتیم بدات بۆ ئەوەی باشیی دونیا و دواڕۆژی تێدایە، درووود و سڵاو بۆ گیانی پاکی پێغەمبەری نازدار ﷺ و تێکڕای کەس و هاوەڵانی.

# گومانی ڕۆژهەڵاتناسان لەبارەی نووسینەوە و کۆکردنەوەی قورئانی پیرۆزەوە

پ.ی. د. ئاراس محەمەد صالح
زانكۆی سلێمانی
كۆلێجی زانستە مرۆڤایەتییەكان ـ بەشی خوێندنی ئیسلامی

# پێشەکی

سوپاس و ستایش بۆ خوای گەورە، سلاو و دروودی خوا بۆ سەر گیانی پێغەمبەری ئیسلام کە پەیامی قورئانی بە مرۆڤایەتی گەیاند. هەروەها سلاو بۆ سەر گیانی ئەو هاوەڵانەی قورئانی پیرۆزیان نووسییەوە و کۆیان کردەوەو ئەم پەیامە گەورەیان گەیاندە دەستی نەوەکانی دوای خۆیان، ڕێگای سەخت و دژواریان بۆ تەخت کردن و وەك چرایەکی ڕووناکی بەخش لە وەیشوومەی ڕۆژگار پاراستیان، لە دوای ئەمە...

بێگومان قورئانی پیرۆز یەکەم سەرچاوەی ئیسلامەو ئیمان و شەریعەت لەو وەردەگیرێن و چرای شەوەزەنگی هەموو مرۆڤێکە و هەموو موسڵمانێك لە ڕێگەی قورئانەوە خوا دەناسێ و لەبەر ڕۆشنایی پەیامی قورئاندا خواپەرستی و ئاینداری دەکات، لەگەڵ دابەزینی یەکەم ئایەتی قورئاندا پێغەمبەر (درودی خوای لەسەر بێت) و هاوەڵەکانی یەکسەر کەوتنە خەمی نووسینەوەو کۆکردنەوەو پاراستنی، لە دوای پێغەمبەریش گەورەترین کارو هەنگاوی هاوەلان بە تایبەتی خەلیفەکانی ڕاشیدین، نووسینەوە و کۆکردنەوەی قورئانی پیرۆز بووەو، زۆر بە ئەمانەتەوە کۆیان کردووەتەوە و لە دووتوێی مەصحەفێکدا ڕێکیان خستووە و پاراستوویانە.

لەگەڵ هەموو ئەمانەشداو لەکاتی دەرکەوتنی تەوژمی ڕۆژهەلاتناسان و هەنگاونانیان بۆ توێژینەوەو لێکۆڵینەوەی سەرچاوەکانی ئایینی ئیسلام بەتایبەتی قورئانی پیرۆز، هەندێك جار لەناو نووسین و توێژینەوەکانیاندا بە مەبەست و بەبێ مەبەست، گومان و بۆچوونیان بلاوکردووەتەوە دەربارەی کۆکردنەوەو نووسینەوەی قورئانی پیرۆزو، کەوتوونەتە هەندێ هەڵەی مەنهەجی و بابەتی و لەناو کتێبەکانیاندا تۆماریان کردووەو، لە کاتی ئێستاشدا ئەو بۆچوون و گومانانە جێگەی قسە لەسەر کردن و وورووژاندنی هەندێك لە نووسەران و ڕۆشنبیرانن، ئەو گومان و بۆچوونانە دووبارە دەکەنەوەو وەك باس و بابەت لە جێگەی مشتومڕو قسە لەسەرکردنی هەندێ ناوەندە، توێژەر دەیەوێت بە پشتبەست بە سەرچاوەی

زانستی و باوەڕپێکراو لەوبارەوە، توێژینەوەیەك پێشکەش بکات و ئەو گومانانە بڕەوێنێتەوە.

## گرنگیی توێژینەوەکە:

گرنگی توێژینەوەکە لەوێوە سەرچاوە دەگرێت کە پەیوەستە بە قورئانی پیرۆزەوەو باس لە مێژووی نووسینەوەو کۆکردنەوەی قورئان دەکات و بەرپەرچی ئەو گومانانە دەداتەوە کە لەو بارەیەوە دەورووژێنرێن، ئەوەندەی توێژەر ئاگاداربێت هەتا ئێستا بە زمانی کوردی لەو بارەیەوە توێژینەوە نەکراوە، ئەم لێکۆڵینەوەیە ئەو بۆشاییە پڕدەکاتەوە.

## کێشەی توێژینەوەکە:

ئایا قورئانی پیرۆز لە سەردەمی پێغەمبەردا (دروودی خوای لەسەر بێت) نووسراوەتەوە؟ ئەو پرۆسەیە چۆن ئەنجام دراوە لە هەردوو سەردەمی مەککە و مەدینەدا؟ هاوەڵان چۆن و بۆچی لە دوای پێغەمبەر گرنگی بە پرۆسەی کۆکردنەوەی قورئان دەدەن؟ ڕۆژهەڵاتناسان بۆچی گومان لەسەر پرۆسەی نووسینەوەو کۆکردنەوەی دروست دەکەن و گومانەکانیان لەکوێوە سەرچاوە دەگرێت؟ ئەم توێژینەوە هەوڵدەدا وەڵامی ئەو پرسیارانە بداتەوە.

## باسی یەکەم:
## نووسینەوە و کۆکردنەوەی قورئانی پیرۆز
## لە سەردەمی پێغەمبەردا (د.خ)

خوای گەورە دوا پەیامی ئاسمانیی خۆی کە قورئانی پیرۆزە، بۆ دوا پێغەمبەر کە حەزرەتی موحەممەدی پێغەمبەری ئیسلامە (دروودی خوای لەسەر بێت) لە شاری مەککە و بە زمانی عەرەبی دادەبەزێنێت، قورئان جیاواز لە پەیامە ئاسمانییەکانی تر، وەك پەیامێکی هەتاهەتایی بۆ مرۆڤایەتی دابەزیوەو بۆ کات و سەردەمێکی تایبەت نەبووە و، هەر ئەمە وا لە پێغەمبەری خوا دەکات کە هەموو ئایەت و سورەتێك بۆی دادەبەزێت تەنها بە لەبەرکردن ڕازی نابێت و نووسەری نیگای هەبووەو هەموو ئایەتەکان زۆر بە شێوەیەکی ورد و گرنگیپێدانەوە دەنووسێتەوە، هەر لە شاری مەککە چەند نووسەرێکی نیگای هەبووەو ئایەتەکانی قورئانیان بۆ نووسیوەتەوە، بۆیە لەگەڵ دابەزینی یەکەم ئایەتی قورئانی پیرۆزدا پرۆسەی نووسینەوەو کۆکردنەوەی قورئان دەستی پێکردووە، بە پێچەوانەی هەندێ بۆچوونی ڕۆژهەلاتناسان کە وا دەزانن کۆکردنەوەو نووسینەوەی قورئانی پیرۆز لە سەردەمی خەلیفەکانی ڕاشدین و، دوای کۆچی دوایی پێغەمبەر (دروودی خوای لەسەر بێت) و لە دوای ڕووداوی یەمامە (واقعة اليمامة) دەستی پێکراوەو ئەو پرۆسەیە ئەنجام دراوە.

پێغەمبەری خوا (دروودی خوای لەسەر بێت) لەگەڵ دابەزینی ئایەتەکانی سەرەتای قورئانی پیرۆز، زۆر گرنگی داوە بە لەبەرکردن و ڕەوان وەرگرتن و نووسینەوەی قورئانی پیرۆز، هەتا ئەو ئەمانەتەی خوا داویەتی بەسەرشانیدا، بە دروستی و بێ کەموکورتی بیگەیەنێتە مرۆڤایەتی، قورئانی پیرۆز ئاماژە بە هەڵوێست و دڵگەرمیی پێغەمبەر دەکات بەرامبەر بە وەرگرتن و لەبەرکردنی قورئانی پیرۆزو دەفەرموێت: (لَا تُحَرِّكْ بِهِ لِسَانَكَ لِتَعْجَلَ بِهِ * إِنَّ عَلَيْنَا جَمْعَهُ وَقُرْآنَهُ

* ﴿فَإِذَا قَرَأْنَاهُ فَاتَّبِعْ قُرْآنَهُ * ثُمَّ إِنَّ عَلَيْنَا بَيَانَهُ﴾[1]، واته: ئەی موحەممەد (درووودی خوای لەسەر بێت) زمانت مەجوڵێنە و پەلە مەکە لە کاتی وەرگرتنی قورئاندا، چونکە لە کاتی دابەزینی نیگاو خوێندنەوەی قورئان لەلایەن جبریلەوە سەلامی خوای لێ بێت، پێغەمبەر هەردوو لێوو زمانی دەجولاّن و پەلەی دەکرد لە ترسی ئەوەی نەبادا شتێکی لە قورئان لە بیر بچێت، یان لە بەری نەکات، خوای گەورە پێی دەفەرموێت پەلە مەکەو زمانت مەجوڵێنە، ئێمە کە خوێندنەوەو گەیاندنی قورئانمان تەواو کرد لەلایەن جبریلەوە، تۆ شوێن خوێندنەوەی ئەو بکەوەو تەفسیرکردن و ڕوونکردنەوەی حوکمەکانی قورئان لە حەلاڵ و حەرام لەسەر ئێمەیە[2].

هەروەها لە ئایەتێکی تردا دەفەرموێت: ﴿فَتَعَالَى اللَّهُ الْمَلِكُ الْحَقُّ وَلَا تَعْجَلْ بِالْقُرْآنِ مِنْ قَبْلِ أَنْ يُقْضَى إِلَيْكَ وَحْيُهُ وَقُلْ رَبِّ زِدْنِي عِلْمًا﴾[3]، ئەم ئایەتەش ئاماژە بۆ ئەوە دەکات کە پێغەمبەر زۆر سوور بووە لەسەر لەبەر کردن و وەرگرتنی قورئان، خوای گەورەش داوای لێ دەکات پەلە نەکات، خوا پەیمانی پێ دەدات کە قورئان لە سنگی پێغەمبەردا کۆبکاتەوە[4]، هەروەها لە ئایەتێکی تردا خوای گەورە بەڵێن بە پێغەمبەر دەدات کە قورئانی بۆ دەخوێنێتەوەو لە بیر ناچێتەوەو دەفەرموێت:

---

١ - سورة القيامة، الآيتان: ١٦-١٩.

٢- بڕوانە: محمد علي الشوكاني، فتح القدير الجامع بين فني الرواية والدراية من علم التفسير، حققه وخرج أحاديثه وفهرسها سيد ابراهيم، الطبعة الأولى ١٤١٣هـ ١٩٩٣م، دار الحديث-القاهرة، م٥ ص٤٨١.

٣- سورة طه، الآية: ١١٤.

٤- بڕوانە: الحافظ ابن كثير، تفسير القرآن العظيم، تحقيق: دكتور السيد محمد السيد و دكتور وجيه محمد احمد و مصطفى فتحي عبدالحكيم و سيد ابراهيم صادق، الطبعة الأولى ١٤٢٣هـ ٢٠٠٢م، دار الحديث- القاهرة، م٥ ص٣٢٧-٣٢٨.

(سَنُقْرِئُكَ فَلَا تَنْسَى)[5]، واته: ئێمه قورئانت بۆ دەخوێنینەوە تۆ لە بیرت ناچێتەوە، ئەو (لا)یە لێرەدا (نافیة)یە، واتە خوا نەفی ئەوە دەکات کە پێغەمبەر ئایەتێکی لە قورئانی پیرۆز لە بیر بچێتەوە.

لەگەڵ ئەوەی پاراستن و کۆکردنەوە و تەفسیرکردنی بەڵێنێکی خواییە بە پێغەمبەری خوا، بەڵام ئەمە واتای ئەوە نەبووە کە ئیتر پێغەمبەر ئەو پرۆسەی پشتگوێ خستبێت و چاوەڕێی ئەوە بووبێت بە موعجیزە قورئان بپارێزرێت، بەڵکو پرۆسەی کۆکردنەوەو نووسینەوەی هەر لە مەککەی پیرۆز دەست پێکردووە، کۆکردنەوەی بە واتای لەبەرکردنی لەلایەن پێغەمبەر و هاوەڵانەوە، کۆکردنەوەی بە واتای نووسینەوەی لە سەر دار و پێستەو پەلکی خورما و بەرد و پارچە ئێسقانەوە لەلایەن نووسەرانی نیگاوە (کتبة الوحي)وە[6].

بەڵگە زۆرە کە لە هەردوو ڕۆژگاری مەککە و مەدینەی پیرۆزدا کە قورئانی پیرۆز نووسراوەتەوە و تەنها بە لەبەرکردنی قورئان لەلایەن پێغەمبەرو هاوەڵانەوە ڕازی نەبوون، لەو بەڵگانەی کە لە قورئاندا باسی نووسراویی قورئان دەکەن و بە کتێب و نووسراو وەسفی دەکەن، وەك دەفەرموێت: (ذَلِكَ الْكِتَابُ لَا رَيْبَ فِيهِ هُدًى لِلْمُتَّقِينَ)[7]، ئەم ئایەتە ئاماژەیەکی ڕوونە کە قورئان نووسراو و کتێب بووە، لە ئایەتێکی تردا قورئان دەفەرموێت: (رَسُولٌ مِنَ اللَّهِ يَتْلُو صُحُفًا مُطَهَّرَةً (٢) فِيهَا كُتُبٌ قَيِّمَةٌ)[8]، وشەی صوحوف بریتییە لە پارچە کاغەزێك، یان هەر شتێکی تری لەو جۆرە شتی لەسەر نووسرابێت.

---

٥- سورة الأعلى، الآية: ٦.

٦- ينظر: الدكتور فضل حسن عباس، اتقان البرهان في علوم القرآن، الطبعة الثانية ١٤٣٠هـ-٢٠١٠م، دار النفائس- الأردن، م١ص ٢٦١. والدكتور عبدالصبور شاهين، تاريخ القرآن، بدون عدد الطبع، دار القلم ١٩٦٦، ص٥٣ وما بعدها.

٧- سورة البقرة، الآية: ٢.

٨- سورة البينة، الآيتان: ١-٢.

چەندین فەرموودەی پێغەمبەر هەن ئاماژە بەوە دەکەن کە قورئانی پیرۆز نووسراو بووە لەسەردەمی پێغەمبەردا، لەو فەرموودانە: ما رواه البخاري ومسلم: (أن رسول الله ﷺ نهى أن يُسَافر بالقرآن إلى أرض العدو)[٩]، هەروەها لە فەرموودەیەکی تردا دەفەموێت: (لا تسافروا بالقرآن، فإني لا آمنُ أن يناله العدو)[١٠].

ئەم فەرموودانە و چەندین فەرموودەی تری پێغەمبەر لەم بارەیەوە ئاماژەیەکی ڕوون و ئاشکران کە قورئان نووسراو بووە لە سەردەمی پێغەمبەری خوا، چ لە شاری مەککەی پیرۆز، چ لە شاری مەدینەی ڕووناك لە دوای کۆچی پیرۆزی پێغەمبەر بۆ ئەو شارە، ئەگەر مەبەست لە پاراستنی قورئان هەر لەبەرکردن بوایە لە سنگی هاوەڵاندا، گومانی ئەوە نەدەکرا کە دەستی ناموسڵمان بکەوێت و بێڕێزی پێ بکرێت لە کاتی سەفەردا بۆ وڵاتی ناموسڵمان.

هەروەها لە فەرموودەیەکی تردا پێغەمبەر دەفەرموێت: (لا تكتبوا عني، ومن كتب عني غير القرآن فليمحه)[١١]. واتە: هیچ شتێك لە منەوە مەنووسنەوە، هەر شتێکتان نووسیوە جگە لە قورئان، بیسڕنەوە. ئەم فەرموودەیە بەڵگەیە کە نووسین لەناو هاوەڵاندا هەبووەو نووسینەوەی قورئان ڕێگەپێدراو بووەو جگە لە نووسەرانی نیگای پێغەمبەر، هەندێکی تر لە هاوەڵان کە توانای نووسینیان هەبووە قورئانیان بۆ خۆیان نووسیوەتەوە، بۆیە پێغەمبەر ئەو بڕیارە دەردەکات و گشتاندنی بۆ دەکات کە کەس جگە لە قورئانی پیرۆز هیچ شتێکی تر کە لە پێغەمبەرەوە وەریگرتووە، نەنووسێتەوە، ئەگەر شتێکیشی نووسیوە با

---

٩- الحديث أخرجه البخاري في كتاب الجهاد، باب السفر بالمصاحف إلى أرض العدو، الرقم: ٢٩٩٠، ومسلم في كتاب الإمارة، باب النهي أن يسافر بالمصحف إلى أرض الكفار، الرقم: ٤٨١٦.

١٠- الحديث رواه مسلم في كتاب الإمارة، باب النهي أن يسافر بالمصحف إلى أرض الكفار، الرقم: ٤٨١٧.

١١- الحديث أخرجه مسلم في كتاب الزهد، باب التثبت في الحديث، وحكم كتابة العلم، الرقم: ٧٤٣٥.

بیسڕێتەوە، بڕیارەکە ڕێگە لە نووسینەوەی فەرموودەی پێغەمبەر دەگرێت بۆ ئەوەی تێکەڵ بە قورئان نەبێت، لەبەر ئەوە ڕێگریی لێ کراوە لەلایەن پێغەمبەرەوە.

زەیدی کوڕی سابت کە یەکێکە لە دیارترین و ناسراوترینی نووسەری نیگای پێغەمبەر، چ لە مەککە و چ لە مەدینە، دەفەرموێت هەر کات پێغەمبەر نیگای بۆ دەهات، دەینارد بە دوامدا و دەچووم بۆم دەنووسییەوە، (عن زيد بن ثابت قال: كنت جار رسول الله ﷺ فكان إذا نزل الوحي أرسل إليَّ فكتبت الوحي)[12]. واتە من دراوسێی پێغەمبەر بووم، کە نیگای بۆ دادەبەزی، بەدوایدا دەناردم و دەچووم بۆم دەنووسییەوە، ئەم فەرموودانە بەڵگەن کە قورئان لەگەڵ دابەزینیدا نووسراوەتەوە.

پێغەمبەری خوا (دروودی خوای لەسەر بێت) تەنانەت لە سەفەری کۆچیشدا لە مەککەوە بۆ مەدینە هەموو هۆیەکانی نووسینی پێ بووەو ئەبوبەکری صدیق کە هاوڕێی کۆچی بووە، یەکێك بووە لە نووسەرانی نیگاو نووسەری پەیمان و ئیشوکاری ڕۆژانەی پێغەمبەر، کەواتە لە هەمان کاتدا هۆیەکانی نووسین و نووسەری لەگەڵدا بووەو لەو سەفەرە پڕ مەترسییەشدا ئەو بابەتەی لە بیر نەکردووە، ئەم گێڕانەوەیە لە ڕووداوی سوراقەی کوڕی مالیکدا دەردەکەوێت، کە داوای پەیمان لە پێغەمبەر دەکات لە دوای چوارپەل داچوونی ئەسپەکەی، کە ئەمانەت نامەیەکی بۆ بنووسێت، پێغەمبەر فەرمان دەکات بە ئەبوبەکری صدیق بۆی بنووسێت، سوراقە دەڵێت: ئەبوبەکر لە سەر پارچەیەك ئێسقان، یان (رقعة)

---

١٢- الحديث أخرجه ابو بكر عبدالله بن سليمان بن الأشعث السجستاني الحنبلي، المعروف بـ ابن أبي داود في كتاب المصاحف، تحقيق الدكتور محب الدين عبدالسبحان واعظ، الطبعة الأولى ١٤١٥هـ ١٩٩٥م، دار البشائر الاسلامية الأولى، بيروت- لبنان، ج١، ص١٤٥.

پێسته، یان کاغەز، یان لەسەر پارچە قورێك ئەو ئەمانەت نامەیە بۆ نووسیم و لای خۆم شاردمەوەو باسم نەکرد هەتا ڕۆژی فەتحی مەککە[١٣].

ئەم گێڕانەوەیە بەڵگەیەکی ڕوون و ئاشکرایە لەسەر گرنگیدانی پێغەمبەر بە نووسین و بوونی نووسین و تا ڕادەیەك ئاسانی هۆیەکانی نووسین و گواستنەوەی نووسراو لە جێگەیەك بۆ جێگەیەکی تر بەشێوەیەکی گونجاو.

١٣- ينظر: الدكتور أكرم ضياء العمري، السيرة النبوية الصحيحة، الطبعة الثامنة ١٤٣٠هـ٢٠٠٩م، مكتبة العبيكان، الرياض، م١ص ٢١٦.

## باسی دووەم:
## نووسەرانی نیگا لە سەردەمی پێغەمبەردا (د.خ)

پێغەمبەری خوا نووسەری نیگای هەبووەو هەر ئایەتێك بۆی دادەبەزی فەرمانی پێدەکردن بینووسنەوەو پێی دەفەرموون ئەم فلانە ئایەتە لە سورەتی فلانە، بەم شێوەیە هەموو ئایەتەکان شوێن و سورەتی دیاری دەکردن و بەو شێوەیە دەنووسرانەوە، لە ناسراوترین ئەو نووسەرانە:

**یەکەم:** عەبدوڵلای کوڕی سەعدی کوڕی ئەبو سەرحی قوڕەیشی، یەکەم کەس بوو نیگای بۆ پێغەمبەری خوا دەنووسییەوە لە شاری مەککەدا، ئەوەبوو تووشی هەڵخلیسکان هات و لە ڕۆژی فەتحی مەککەدا هاتە خزمەتی پێغەمبەر و موسڵمان بووەو دەستی کردەوە بە نووسینەوەی نیگا بۆ پێغەمبەر و (لە ساڵی ٣٦ ك کۆچی دوایی کرد).

**دووەم:** عوسمانی کوڕی عەفان، سێیەم خەلیفەی ڕاشدین، نووسەر و خوێنەری قورئان بوو، ئەوەبوو لەسەردەستی ئەو قورئان کۆتا کۆکردنەوەی وەرگرت و کرایە مەصحەف و لە ساڵی٣٥ ك کۆچی دوایی کرد.

**سێیەم:** عەلی کوڕی ئەبو تالیب و ئامۆزای پێغەمبەرو چوارەم خەلیفەی ڕاشدین، زۆرترینی نیگای بۆ پێغەمبەر نووسیوەتەوە، هەروەها زۆر گرێبەست و پەیمان و ڕێکەوتننامەی بۆ پێغەمبەر نووسیوەتەوە، (ساڵی ٤٠ك کۆچی دوایی کرد).

**چوارەم:** ئوبەیی کوڕی کەعبی ئەنصاری، یەکەم نووسەری نیگای پێغەمبەر بوو لە شاری مەدینە و بە سەیدی خوێنەرانی قورئان دادەنرێت، (ساڵی ٣٠ك کۆچی دوایی کرد).

**پێنجەم:** زەیدی کوڕی سابتی ئەنصاری، ناسراوترین و چالاکترین نووسەری نیگای پێغەمبەر بووە، هیچ کارێکی تری نەکردووە جگە لە نووسینەوەی نیگا بۆ پێغەمبەری خوا، (ساڵی ٤٥ك کۆچی دوایی کردووە).

**شەشەم:** موعاویەی کوڕی ئەبو سوفیان، باوکی لە دوای فەتحی مەککە داوای لە پێغەمبەر کرد بیکاتە نووسەری نیگای خۆی، پێغەمبەریش کردیە نووسەری خۆی و لەدوای ئەویش بەردەوام بوو لە نووسینەوەی قورئان (ساڵی٦٠ ك کۆچی دوایی کرد).

ئەم شەشە نووسەری تایبەتی قورئانی پیرۆز بوون، جگە لەمانە نووسەری تریش هەبووەو هاوەڵ هەبووە قورئانی پیرۆزی بۆ خۆی نووسیوەتەوە بەبێ فەرمانی پیغەمبەر.

پێغەمبەر نووسەری نامە و ڕێکەوتننامە و بانگەواز و پێویستی تری ژیانی ڕۆژانەی هەبووە، لەوانە:

ئەبوبەکری صدیق، عومەری کوڕی خەتاب، حەنزەلەی کوڕی ڕەبیع، زوبێری کوڕی عەوام، خالیدی کوڕی سەعید کوڕی عاص، سابتی کوڕی قەیس، موغیرەی کوڕی شوعبە، موعازی کوڕی جەبەل و هتد[١٤].

هەموو ئەمانە بەڵگەی ڕوون و ئاشکران کە قورئانی پیرۆز هەر لە سەرەتاوەو لە شاری مەککە و شاری مەدینەی پیرۆزدا و لە سەردەمی پێغەمبەردا نووسراوەتەوە و بە فەرمانی پێغەمبەر و نووسەری تایبەت هەبووە بۆ نووسینەوەی قورئان و هەموو ئایەت و سورەتەکانی قورئان بە نووسراوی لە دوای پێغەمبەر بە تەواوی هەبوون.

ئەو بۆچوونانەی کە دەڵێن کۆکردنەوەی قورئان لە دوای کۆچی دوایی پێغەمبەر (دروودی خوای لەسەر بێت) دەستی پێکردووە، ئەمە ڕای ڕۆژهەڵاتناسانە، ئەوان وا تەفسیری دەکەن کە پرۆسەی نووسینەوەو کۆکردنەوەی

١٤- أبو عبد الله محمد بن علي بن أحمد بن حديدة الأنصاري، المصباح المضيء في كتاب النبي الأمي ورسله إلى ملوك الأرض من عربي وعجمي، تحقيق محمد عظيم الدين، دار النشر، عالم الكتب - بيروت - ١٤٠٥هـ، ج١، ص٢١ وما بعدها.

قورئان له دوای كۆچی دوایی پێغەمبەر و دوای دوو ساڵ و له سەردەمی ئەبوبەكری صدیقدا ئەنجام دراوە[١٥]، ئەم كۆكردنەوەیە بەواتای كردنی قورئانی پیرۆزە بە كتێبێكی ڕیزبەندكراو (مصحف مصنف)، بە واتای ئەوە نییە كە پێشتر قورئان كۆنەكراوەتەوەو نەنووسراوەتەوە، بەڵكو هەر لە شاری مەككە وەك پێشتر باسمان كرد، پێغەمبەر نووسەری نیگای هەبووە و (الإمام السیوطي) ئاماژەی پێ دەكات كە نووسەرانی نیگا ژمارەیان نزیكەی چل و سێ نووسەر بووە[١٦]، هەموو سورەت و ئایەت و ناوی سورەت و شوێنی ئایەتەكان بە فەرمانی خوا و دانانیان لە شوێنی دیاریكراوی خۆیاندا بە فەرمانی پێغەمبەر بووە، واتە هەموویان (توقیفي)ن و بە ئیجتیهاد نەبووە[١٧].

١٥- ینظر: الدكتور محمد محمد أبو لیلة، القرآن الكریم من المنظور الاستشراقي دراسة نقدیة تحلیلیة، الطبعة الأولى ١٤٢٣هـ ٢٠٠٢م، دار النشر للجامعات، مصر، ص ١٤٥-١٤٦.

١٦- السیوطي، الاتقان في علوم القرآن، تحقیق احمد بن علي، بدون عدد الطبع، ١٤٢٥هـ٢٠٠٤م، دار الحدیث-القاهرة، ج١، ص٢١٩-٢٢٠.

١٧- ینظر: عبدالرحمن عمر محمد اسبینداري، كتابة القرآن الكریم في العهد المكي، الطبعة الأولى ١٤٢٣هـ٢٠٠٢م، من منشورات المنظمة الاسلامیة للتربیة والعلوم والثقافة، المملكة المغریبیة، ص٩٩.

## باسی سێیەم:

## پرۆسەی گواستنەوەی قورئانی پیرۆز لە شاری مەککەوە بۆ شاری مەدینە

یەکێکی تر لەو باسانەی کە ڕۆژهەڵاتناسان باسی لێوە دەکەن، پرۆسەی گواستنەوەی قورئانی مەککییە کە لە ماوەی سیازدە ساڵدا دابەزیوە بۆ پێغەمبەر و سێیەکی قورئانی پیرۆز پێك دەهێنێ، ئەوان دەڵێن ئەگەر قورئان نووسرابێتەوە لە شاری مەککەدا لەسەر پێستەو بەردو ئێسقان و پەلکی دار خورما، بەلانی کەمەوە ئەو پارچە نووسراوانە لەکاتی کۆچی پێغەمبەردا لە مەککەوە بۆ مەدینە باری چوار حوشتر بووە، ئەی بۆ باس نەکراوە کە کێ و چۆن ئەو قورئانە نووسراوە گوستراوەتەوە بۆ مەدینە لەگەڵ بوونی ترس و نەبوونی ئاسایشی ڕێگای کۆچ بۆ مەدینە[١٨]؟، ئەی ئەگەر قورئانی نووسراوی مەککە نە گواستراوەتەوە بۆ مەدینە، چارەنووسی چی بووە؟ هیچ بەڵگەو گێڕانەوەیەکیش نییە کە ئەو قورئانە نووسراوە کەوتبێتە دەستی موشریکینی مەککە، ئەی ئەگەر پێغەمبەر قورئانی نووسراوی مەککەی نەگواستووەتەوە، چ کاتێك و کێی ڕاسپارد جارێکی تر لە مەدینە قورئانی مەککی بنووسێتەوە؟ بۆ هیچ ڕیوایەتێك باس لەو پرۆسەیە ناکات؟

ئەو بۆچوونەی کە ئاماژە بەوە دەکات کە زۆر کەم باس لە پرۆسەی گواستنەوەی قورئانی نووسراوی مەککی دەکات بۆ مەدینە، تا ڕاددەیەك ڕاستەو لەگەڵ گەورەیی و گرنگی قورئانی پیرۆزدا جێگەی هەڵوێستە لەسەر کردنە، بەڵام لەگەڵ ئەوەشدا لە چەند سەرچاوەیەکی گرنگدا باس لەو بابەتە کراوەو هەر یەك

١٨- ينظر: الدكتور احمد نصري، آراء المستشرقين الفرنسيين في القرآن الكريم، الطبعة الأولى ٢٠٠٩م، دار القلم- الرباط، ص ٢٠٤ وما بعدها.

له (ابن قدامة المقدسي)[19] و (ابن حجر العسقلاني)[20] باس لەوە دەکەن کە (رافع بن مالك) کە لە پەیمانی (العقبة)دا بە خزمەتی پێغەمبەر گەیشت، هەموو ئەو قورئانەی لە ماوەی دە ساڵدا بۆ پێغەمبەر دابەزی بوو، پێیداو گواستیەوە بۆ مەدینە، (رافع بن مالك) بەردەوام لە نێوان مەککەو مەدینەدا لە هاتووچۆدا بووە، بە خزمەتی پێغەمبەر دەگەیشت و قورئانی لێ وەردەگرت و فێری خوێندنەوەی قورئان دەبوو، لە پێش کۆچیشدا قورئانی نووسراوی بردووەتە مەدینە، جگە لە (رافع) هەر یەك لە هاوەڵانی پێغەمبەر لە مەککەوە کۆچی دەکرد بۆ مەدینە بە بڕی جیاواز قورئانی نووسراویان لەگەڵ خۆیاندا بردووە، موصعەبی هاوەڵی پێغەمبەر کە لە پێش کۆچدا چووە بۆ مەدینە بۆ فێرکردنی باوەڕداران، قورئانی پیرۆزی بردووەو بەردەوام هەر ئایەت و سورەتێکی نوێ دابەزی بێت بۆ پێغەمبەر، بۆی ناردووەو نامەو نامە گۆڕینەوە هەبووە لە نێوانیاندا، جگە لەمانەش پێغەمبەر لە کاتی کۆچیدا بۆ مەدینە سێ حوشتری پێ بووەو هەموو ماددەکانی نووسینی پێ بووەو دەکرێت قورئانی نووسراوی مەکەش لەو بارەدا بووبێت[21].

یەکێك لەو ماددانەی کە قورئانی پیرۆزی لەسەر نووسراوەتەوە، بریتی بووە لە (الرقاع)، ئەم ڕیقاعە هەروەك ئیمامی (السيوطي) ئاماژەی پێ دەدات، بریتی بووە لە کاغەز، یان پێستەیەکی تەنکی ناسك[22]، ئەو مادە کاغەز بێت یان پێستەی تەنك، ئەگەر قورئانی پیرۆزی لەسەر نووسرابێتەوە، کێش و قەبارەی زۆر نەبووەو

---

١٩- موفّق الدين عبدالله ابن قدامة المقدسي، الإستبصار في نسب الصحابة الأنصار، تحقيق علي نويهض، الطبعة الأولى, ١٣٩١هـ - دار الفكر – بيروت، ص ١٧٤.

٢٠ - ابن حجر العسقلاني، الاصابة في تميز الصحابة، تحقيق علي محمد البجاوي، الطبعة الأولى ١٤١٢هـ ١٩٩٢م، دار الجيل- بيروت، م٢ ص ٤٤٤.

٢١- ينظر: عبدالرحمن عمر محمد اسبينداري، كتابة القرآن الكريم في العهد المكي، ص١٠٨-١٠٩.

٢٢- ينظر: الامام السيوطي، الاتقان في علوم القرآن، تحقيق أحمد بن علي، بدون عدد الطبع، ١٤٢٥هـ ٢٠٠٤م، دار الحديث، القاهرة، ج١ ص٢١٩-٢٢٠.

دەکرێت بە ئاسانی گواسترابێتەوە بۆ شاری مەدینە، هەروەها پێغەمبەر لەسەری کۆچدا لەگەڵ ئەبوبەکری صدیقدا سێ حوشتر باریان پێ بووەو دەکرێت قورئانی پیرۆزیش لەو بارانەدا بووبێت.

ئاماژەکانی قورئانی پیرۆز بە (قەڵەم) و (قرطاس) و (صحف و صحیفة) و (کتاب)، دەکرێت ئەو شتانە بەلای عەرەبەوە نەناسراو نەبووبن و لە نووسینەوەی قورئاندا بەکار هاتبن، هەروەها دەکرێت پاشماوەکانی تەورات و ئینجیل لەسەر کاغەزو لە شێوەی کتێبدا بووبن، بۆیە قورئانی پیرۆز و کۆمەڵگای ئەوکاتەی مەککە و مەدینە بە ئەهلی کیتاب ناویان دەبەن، ڕاستە دروستکردنی کاغەز لای خەڵکی مەککە و مەدینە نەبووە، بەڵام دەکرێت بە هۆی خوێندەواریی ئەهلی کیتاب و لە ڕێگەی بازرگانییەوە لەلایەن فارس و ڕۆمەکانەوە هاتبێتە وڵاتی حیجازو دەکرێت قورئانی پیرۆزیش لەسەر کاغەز نووسرابێتەوە.

## باسی چوارەم:
## کۆکردنەوەی قورئان لە سەردەمی ئەبوبەکری سدیقدا

هاوەڵانی پێغەمبەر لە ڕووی بەرپرسیاریانەوە بەرامبەر قورئانی پیرۆز، ژمارەیەکی زۆریان قورئانیان لەبەر بووە، پاراستنی قورئانیش لەناو سنگی تاکەکەسدا بە مردنی کەسەکە ئەگەر نەنووسرابێتەوە، لەگەڵ خۆیدا کۆتایی دێت، لە دوای کۆچی دوایی پێغەمبەر و سەرهەڵدانی جەنگی هەڵگەڕاوەکان (حروب الردة)، کە کارەساتێکی گەورەو کاریگەر بوو ڕووبەڕووی موسڵمانان بووەوە لەو کاتە ناسکەدا، لەو شەڕانەدا زۆرێك لە هاوەڵان کە قورئانی پیرۆزیان لەبەربوو، لە هەمان کاتیشدا خوێنەری قورئان بوون (قرّاء القرآن) شەهید بوون، لێرەوە ترسی هاوەڵان لە ونبوونی بەشێکی ئایەتەکانی قورئان لایان دروست بوو، بۆیە کەوتنە بیری ئەوەی کە قورئانی پیرۆز بنووسنەوە و لە یەك مەصحەفدا کۆیبکەنەوە.

یەکەم کەسێك کە دەکەوێتە بیری کۆکردنەوەو نووسینەوەی قورئان لە مەصحەفێکدا، عومەری کوڕی خەتابە، دەچێت بۆلای ئەبوبەکری صدیق و باسی ئەوەی بۆ دەکات کە لە شەڕی یەمامەدا ژمارەیەکی زۆر لەوانەی قورئانی پیرۆزیان لەبەربوو شەهید بوون، بۆیە پێویستە قورئانی پیرۆز بنووسینەوەو لە یەك مەصحەفدا کۆیبکەینەوە، زەیدی کوڕی سابیت دەڵێت: ئەبوبەکری صدیق ناردی بە شوێنمدا لە دوای جەنگی یەمامەوە، کاتێك چووم بۆلای، عومەری کوڕی خەتاب لای دانیشتبوو، فەرمووی: عومەر هات بۆلام، پێی وتم کە بە هۆی شەڕەوە لە ڕۆژی یەمامەدا زۆرێك لەوانەی قورئانیان لەبەربووە شەهید بوون، منیش ترسی ئەوەم هەیە بەهۆی جەنگەوە ئەوانەی قورئانیان لەبەرە شەهید بن و هەندێك لە ئایەتەکانی قورئان ون ببێت، من وادەبینم داوای کۆکردنەوەی قورئان دەکات، من بە عومەرم وت چۆن کارێك دەکەی کە پێغەمبەری خوا (دروودی خوای لەسەر بێت) نەیکردووە، عومەر وتی بەخوا کارێکی پیرۆزو چاکە، عومەر بەردەوام لەگەڵم گفتوگۆی کرد، هەتا خوای گەورە دڵی کردمەوەو چوومە سەر ڕا و بۆچوونەکەی

ئەو، زەید دەڵێت: ئەبوبەکر پێیفەرمووم: تۆ کەسێکی گەنج و عاقڵ و دەستپاکی و گومانی خراپت پێنابەین، تۆ نووسەری وەحی پێغەمبەری خوا (دروودی خوای لەسەر بێت) بوویت، بۆیە باشترین کەسی بۆ کۆکردنەوەو نووسینەوەی قورئان و ئەو کارەمان بۆ بکە، زەید دەڵێت: بەخوا تەکلیفی گواستنەوەی یەکێك لە شاخەکانی پیّ بسپاردمایە بەلامەوە ئاسانتر بوو لەو کارە، وتم چۆن کارێك دەکەن کە پێغەمبەری خوا (دروودی خوای لەسەر بێت) نەیکردووە، وتی بەخوا کارێکی باشە، ئەبوبەکری صدیق لەگەڵم ڕاوێژی کرد هەتا خوای گەورە دڵی لەسەر ئەو کارە پیرۆزە جێگیر کردم، کە دڵی ئەبوبەکرو عومەری لەسەر جێگیر کردبوو، دەستم کرد بە کۆکردنەوەی قورئان کە لەسەر بەرد و تەختەو پەلکی دارخورما و سنگی هاوەڵان، هەتا گەیشتمە کۆتایی سورەتی (التوبة) لەگەڵ ئەبو خوزەیمەی ئەنصاری، لە ئایەتی: (لَقَدْ جَاءكُمْ رَسُولٌ مِّنْ أَنفُسِكُمْ عَزِيزٌ عَلَيْهِ مَا عَنِتُّمْ حَرِيصٌ عَلَيْكُم بِالْمُؤْمِنِينَ رَؤُوفٌ رَّحِيمٌ)[٢٣]. هەتا کۆتایی سورەتەکە تەنها لای ئەو دەستم کەوت، هەموویم لە مەصحەفێکدا کۆکردەوە، ئەم مەصحەفە لای ئەبوبەکر بوو هەتا وەفاتی کرد، دوایی لای عومەری کوڕی خەتاب بوو هەتا وەفاتی کرد، دوای ئەو لای حەفصەی کچی عومەر بوو[٢٤].

---

٢٣- سورة التوبة، الآية: ١٢٨.

٢٤- رواه البخاري، كتاب تفسير القرآن، باب (لقد جاءكم رسول...) الرقم: ٤٦٧٩.

## باسی پێنجەم:
## بۆچی قورئان لە سەردەمی پێغەمبەردا نەکرا بە یەك مەسحەف

لە سەردەمی پێغەمبەردا (دروودی خوای لەسەر بێت) قورئان لە دووتوێی کتێبێکدا کۆنەکراوەتەوە، بەڵکو نووسەرانی نیگا لە سەر ئەو دار و بەرد و ئێسقان و پەلکی خورما و ئەو مادانەی قورئانیان لە سەر نووسراوەتەوە، نووسیویانەتەوە و لە شوێنێکی تایبەتدا پارێزراوە، لێرەدا ئەو پرسیارە دێتە پێشەوە، بۆچی پێغەمبەر لە ڕۆژگاری خۆیدا قورئانی لەناو یەك مەصحەفدا کۆنەکردەوەو لە دوای خۆی خەلیفەکانی ڕاشدین ئەو پرۆسە گرنگەیان ئەنجامدا؟ چونکە قورئانی پیرۆز لەماوەی بیست و سێ ساڵدا دابەزیوە بۆ پێغەمبەری خوا بە شێوەی جیا جیا، (منجما) هەندێ سورەت لە ماوەی چەند ساڵێکدا دابەزیون و نەدەکرا قورئان بە ڕیزبەندی بنووسرێتەوە، هەموو جارێك ئایەتێك یان چەند ئایەتێك دابەزی، جارێکی تر تێك بدرێتەوەو بنووسرێتەوە، چونکە قورئانی پیرۆز بەم ڕیزبەندییەی ئێستای کە پێ نووسراوەتەوە، نەهاتووەتە خوارەوە، بەڵکو زۆر سورەتی مەککی کە لە سەرەتای نیگاوە هاتووەتە خوارەوە، لە کۆتایی قورئاندا نووسراوەتەوە، بۆ نمونە جزمی (عم) کە زۆربەی سورەتەکانی مەککین، لە کۆتایی قورئانەوەیە و سورەتی (العلق) کە یەکەم سورەتە لە قورئانی پیرۆز هاتووەتە خوارەوە بۆ پێغەمبەر (دروودی خوای لەسەر بێت)، لەم جزمەدایەو نەکەوتووەتە سەرەتای قورئانەوە.

هەروەها بەهۆی بەردەوام نەسخبوونەوەی چەند ئایەت و سورەتێك لە قورئانی پیرۆز، ئەگەر لەناو یەك مەصحەفدا بنووسرایەتەوە و کۆبکرایەتەوە، جارێکی تر دەبوو پرۆسەکە تێك بدرێتەوەو سەرلەنوێ کۆبکرێتەوە، لەبەر ئەم هۆیانە پێغەمبەر لە کاتی خۆیدا لەناو یەك مەصحەفدا قورئانی کۆنەکردووەتەوە، بەڵام هەمووی نووسراوەتەوەو پارێزراوە، لە سەردەمی خەلیفەکانی ڕاشدینیشدا، قورئانی پیرۆز لەسەر ئەو پارچە ئێسقان و دار و بەرد و قوڕ و چەرم و کاغەزانەی

که نووسراونەتەوە و لە سنگی هاوەڵانەوە کۆکراوەتەوە و کراوە بە مەصحەفێکی ڕیزبەندکراو، هەروەك چۆن پێغەمبەر فەرمانی کردووە بە نووسەرانی نیگا کە بەو شێوەیە بینووسنەوەو ڕیزبەندی بکەن، بۆیە ئەو مەصحەفەی ئێستا لەبەردەستی موسڵماناندایە، ئەو مەصحەفەیە کە بە فەرمانی خەلیفەکانی ڕاشدین کۆکراوەتەوە و نووسراوەتەوە[٢٥].

٢٥- ينظر: الدكتور فهد بن عبدالرحمن بن سليمان الرومي، دراسات في علوم القرآن، الطبعة السابعة عشر ١٤٣٢هـ ٢٠١١م، الرياض، ص ٧٩ وما بعدها.

## باسی شەشەم:

## گومانی ڕۆژهەڵاتناسان لەبارەی نووسینەوە و کۆکردنەوەی قورئانی پیرۆز و سەرچاوەکانیان

ڕۆژهەڵاتناسان کاتێك باس لە کۆکردنەوەو نووسینەوەی قورئان دەکەن، زیاتر وەك پرۆسەی کۆکردنەوەی ئینجیل وێنای دەکەن[٢٦]، بەڵام ئەوە یەکێکە لەو ئیشکالیەتە مەنهەجییانە کە ڕۆژهەڵاتناسان لەو بابەتە گرنگ و هەستیارەدا پەیڕەویان کردووە، یەکەم خاڵێك لێرەدا پێویستە ئاماژەی پێ بکەین، ئەوەی کاتی کۆکردنەوەو نووسینەوەی هەریەکە لە ئینجیل و قورئان، دوو کات و دوو سەردەمی تەواو جیاوازن و لە سەردەمی قورئان و پرۆسەی کۆکردنەوەیدا نووسین و نووسراو هەبووەو پێغەمبەری ئیسلام هەموو پەیامی قورئانی گەیاندووە بە موسڵمانان و زۆرێك لە هاوەڵانی لەبەریان کردووە، لە هەمان کاتدا قورئان بە نووسراوی لە دوای کۆچی دوایی پێغەمبەر هەبووەو، وەك پرۆسەیەکی گرنگ لە کاتی دابەزینی بۆ پێغەمبەری خوا لەلایەن نووسەرانی نیگاوەو نووسراوەتەوە، کە لە سەردەمی خەلیفەکانی ڕاشدیندا دەست کراوە بە کۆکردنەوەو نووسینەوەی قورئان و کاتەکەی لەگەڵ وەفاتی پێغەمبەردا نێوانی زۆر نەبووە، کە هیچ یەك لەم خاڵانە لەکاتی کۆکردنەوەی ئینجیلدا بوونیان نەبووە، جگە لەمانە کۆکردنەوەی قورئان لە یەك مەصحەفدا کۆدەنگیی هاوەڵانی پێغەمبەری لە سەر بووەو جگە لەو مەصحەفە هیچ مەصحەفێکی تر نەبووە بە درێژایی مێژووی ئیسلامیی[٢٧].

---

٢٦- ينظر: تيودور نولدكة، تاريخ القرآن، تعريب د. جورج تامر مع فريق عمل السيدة عبلة معلوف ود. خيرالدين عبدالهادي و د. نيقولا ابو مراد، تعتمد هذه الطبعة على الطبعة الرابعة، بغداد ٢٠٠٨م، منشورات الجمل، ص ٥-٦.

٢٧- ينظر: د.موسى ابراهيم الابراهيم، بحوث منهجية في علوم القرآن الكريم، الطبعة الثانية ١٤١٦هـ ١٩٩٦، دار عمار، عمان، ص ٤٦ وما بعدها.

پرۆسەی کۆکردنەوەو نووسینەوەی قورئان لەگەڵ هاتنەخوارەوەی یەکەم ئایەتی قورئاندا دەستی پێکردووە و ئەو پرۆسە لە دوای ڕووداوی (واقعة اليمامة) و لە دوای شەهیدبوونی حەفتا هاوەڵی پێغەمبەر کە قورئانیان لەبەر بوو، دەستی پێکرد، عومەری کوڕی خەتاب ئەو هەستەی لادروست بوو کە کاتی ئەوە هاتووە قورئانی پیرۆز لە ناو دووبەرگی یەك مەصحەفدا کۆبکرێتەوە، بۆ ئەم مەبەستە ڕاوێژ بە ئەبوبەکری صدیق دەکات و هەردوولا لەسەر ئەو مەبەستە پیرۆز ڕێکدەکەون و زەیدی کوڕی سابت بۆ ئەو مەبەستە دەستنیشان دەکەن، چونکە زەید نووسەری وەحی پێغەمبەری خوا بوو، زۆر بەتوانا و شارەزا بوو، باشترین کەس بوو بۆ ئەو مەبەستە، زەید بۆ کۆکردنەوەی قورئان لە ناو یەك مەصحەفدا پشتی بە قورئانی نووسراو (مسطور) و قورئانی لەبەرکراو (محفوظ) لە سنگی هاوەڵاندا دەبەست و هەموو قورئانی بەو تەرتیبەی کە پێغەمبەر (درووودی خوای لەسەر بێت) فەرمانی پێکردبوو، کۆکردەوە[28].

ئەو ڕیوایەتەی کە زەید دەفەرموێ ئایەتی: (لَقَدْ جَاءَكُمْ رَسُولٌ مِنْ أَنْفُسِكُمْ عَزِيزٌ عَلَيْهِ مَا عَنِتُّمْ حَرِيصٌ عَلَيْكُمْ بِالْمُؤْمِنِينَ رَءُوفٌ رَحِيمٌ)[29] لای کەس ئەو ئایەتەم دەست نەکەوت تەنها لای ئەبی خوزەیمەی ئەنصاری نەبێت[30]، بە نووسراوی دەستی نەکەوتووە، ئەگەرنا زۆرێك لە هاوەڵان و خودی زەیدیش و هەریەك لە ئەبوبەکری صدیق و عومەری کوڕی خەتاب ئەو ئایەتەیان لەبەر بوو، ئێستا کە ڕۆژهەڵاتناسان دەڵێن ئەو ئایەتە تەنها لای ئەبو خوزەیمە بووە، بۆ ئەوەیە بڵێن قورئان هەموو بە

---

٢٨- رواه البخاري، كتاب تفسير القرآن، باب قوله (لقد جاءكم رسول..)، الرقم: ٤٦٧٩.

٢٩- سورة التوبة، الآية: ١٢٨.

٣٠- رواه البخاري، كتاب تفسير القرآن، باب قوله (لقد جاءكم رسول..)، الرقم: ٤٦٧٩.

ڕیوایەتی (تواتر) کۆنەکراوەتەوە، تەنانەت پێغەمبەر دەفەرموێت شایەتی ئەبو خوزەیمە بە شایەتی دوو کەسە[٣١].

لە تایبەتمەندییەکانی پرۆسەی کۆکردنەوەی قورئانی پیرۆز لە سەردەمی ئەبوبەکری صدیق و عومەری کوڕی خەتابدا ئەمانەن:

**یەکەم:** پاڵنەری سەرەکی کە وای لێکردن قورئان کۆبکەنەوە، هەستکردنیان بە زەروورەتی ئەو پرۆسەیە بوو، هەتا بەهۆی مردن و شەهیدبوونی هاوەڵانەوە کە زۆربەیان قورئانیان لەبەر بوو، هەندێکیشیان نووسەری وەحی پێغەمبەر بوون و ئاگاداری دابەزین و هەموو وردەکارییەکانی بوون، بۆ ئەوەی دوای قورئان نەبێتە جێگەی گومان و ڕەخنەگرتن.

**دووەم:** پرۆسەکە بە بەهێزترین ڕێبازی توێژینەوە نووسراوەتەوە، بە پشتبەستن بە قورئانی نووسراو و لەبەرکراو، لەبەرکراوەکەیش بە تەنها لە یەك کەس وەرنەگیراوەو هەمووی بە پلەی (تواتر) نووسراوەتەوە.

**سێیەم:** کۆدەنگیی هاوەڵان و زانایان و ئومەتی ئیسلامیی لەسەر ئەو مەصحەفە.

**چوارەم:** تەنها ئەو سورەت و ئایەتانەیان نووسیوەتەوە کە خوێندنەوەیان نەسخ نەبووەتەوە.

**پێنجەم:** بە حەوت پیتەکە (لەهجەکە) (حروف سبعة) نووسیویانەتەوە بۆ ئەوەی خوێندنەوەی ئاسان بێت بۆ هەموو لەهجەکان[٣٢].

---

٣١ - ینظر: الدكتور فضل حسن عباس، اتقان البرهان في علوم القرآن، م ص. و ینظر: د.موسى ابراهيم الابراهيم، بحوث منهجية في علوم القرآن الكريم، ص٤٩.

٣٢ - ینظر: محمد عبدالعظيم الزرقاني، مناهل العرفان في علوم القرآن، تحقيق فواز احمد زمرلي، الطبعة الأولى، ١٤١٥هـ١٩٩٥، دار الكتاب العربي، بيروت، ج١، ص٢٠٤ وما بعدها. و د. موسى ابراهيم الابراهيم، بحوث منهجية في علوم القرآن الكريم، ص٥١.

کۆکردنەوەی قورئانی پیرۆز لە سەردەمی عوسمانی کوڕی عەفاندا بەردەوام بوو، بەڵام بە شێوازێکی تر لە کۆکردنەوەی ئەبوبەکری صدیق و عومەری کوڕی خەتاب، فاکتەری سەرەکی لە قۆناغی یەکەمدا ترس لە شەهیدبوون و مردنی هاوەڵان و ونبوونی بەشێك لە ئایەتەکانی قورئان بوو، بەڵام لە سەردەمی عوسمانی کوڕی عەفاندا، فراوانبوونی سنووری دەوڵەتی ئیسلامی و موسڵمانبوونی نەتەوە جیاوازەکان و هاتنی شێوەزار و ئاوازو خوێندنەوەی جیاواز، پاڵنەری سەرەکی بوون، عوسمانی کوڕی عەفان هەموو قورئانی بەیەك لەهجەو ڕەسم نووسییەوە و ناردی بۆ ناوچە جیاوازەکان، هەتا هەموو موسڵمانان لەسەر یەك مەصحەفی تایبەت کۆبکاتەوەو هەم ئاسان بێت و لە هەمان کاتدا خیلافی ناو موسڵمانان کەم بکاتەوە. بۆ ئەم مەبەستە چوار هاوەڵی زۆر شارەزاو لێهاتووی هەڵبژارد کە ئەوانیش هەریەکە لە (زيد بن ثابت، عبدالله بن الزبير، سعيد بن العاص، عبدالرحمن بن حارث بن هشام) بوون، عوسمانی کوڕی عەفان ناردی بەدوای ئەو مەصحەفەی کە لە سەردەمی ئەبوبەکری صدیق و عومەری کوڕی خەتابدا کۆکرابووەوەو لای حەفصەی کچی عومەری کوڕی خەتاب بوو، هێنایان، لە هەندێ گێڕانەوەدا دەڵێن ئەو لیژنەیەی عوسمان ڕایسپاردن بۆ نووسینەوەی قورئان، دوانزە هاوەڵ بوون و هەموو ئایەتێك بۆ هەموویان خوێنراوەتەوەو بە تێکڕا شایەتی ئەوەیان داوە کە پێغەمبەر بەو خوێندنەوەیە ئەو ئایەتەی خوێندووەتەوە، لە پاش ئەمە نووسیویانەتەوە.

**یەکەم:** نووسینەوەی قورئانی پیرۆز بە یەك لەهجە (حرف واحد) و وازهێنان لە (أحرف سبعة).

**دووەم:** تەنها نووسینەوەی ئەو ئایەتانەی دەگەنە ئاستی (تواتر) و وازهێنان لە (خبر آحاد).

**سێیەم:** نە نووسینەوەی ئەو ئایەتانەی خوێندنەوەیان نەسخ بووەتەوە.

**چوارەم:** نووسینەوەی سورەت و ئایەتەکان بەم تەرتیبەی ئێستای کە هەمووی تەوقیفییە.

**پێنجەم:** بەبێ خاڵبەندی، واتە پیتەکان خاڵ و سەر و بۆر و ژێریان نەبووەو بەو شێوەیە قورئانی پیرۆزی نووسییەوە و یەك جۆر مەصحەف هەڵبژێردراو بە کۆدەنگیی هاوەڵان مەصحەفەکانی تر سووتێنران، بۆ ئەوەی ئومەی ئیسلامیی لە جیاوازی و دووبەرەکی ڕزگاری ببێت[٣٣].

---

٣٣- ينظر: الزرقاني، مناهل العرفان في علوم القرآن، ج١ ص ٢١٠ وما بعدها.

## باسی حەوتەم:
## ڕەواندنەوەی چەند گومانێکی ڕۆژهەڵاتناسان

ڕۆژهەلآتناسان زۆر گرنگییان بە قورئانی پیرۆزو نووسینەوەو کۆکردنەوەی داوە و چەندین نووسین و توێژینەوەیان لەوبارەیەو ئەنجامداوە، ئەویش لەبەر گرنگی و گەورەیی و کاریگەریی قورئانی پیرۆزە وەك یەکەم سەرچاوەی ئایینی ئیسلام، ئەو ڕۆژهەلآتناسانە کات و توانای زۆریان تەرخان کردووە بۆ لێکۆڵینەوە لە مێژووی قورئان و چۆنیەتی نووسینەوەو کۆکردنەوەی بەپێی ئەو قۆناغە مێژووییانەی پێیاندا تێپەڕبووە، هەر ئەمەیش وایکردووە لەناو کەلەپووری ڕۆژهەلآتناسیدا ژمارەیەکی زۆر نووسراو لەبارەی قورئانەوە بەرچاو دەکەون، ئەو نووسینانە شتی زۆر وردو سەرنجڕاکێشیان تێدایە، لەهەمان کاتدا هەندێ جار هەڵەی مەنهەجیی گەورەیان کردووەو هەندێ جاریش بۆ مەبەست هەوڵیانداوە گومان لەبارەی پرۆسەی نووسینەوەو کۆکردنەوەی قورئان و ئەو کەسانەوە دروست بکەن کە ئەو پرۆسە گەورەیان ئەنجاداوە، لەو گومانانەش:

**یەکەم:** تاوانبارکردنی عوسمانی کوڕی عەفان بە سووتاندنی قورئانی پیرۆز لە کۆن و نوێدا شتێکی بێبنەماو لاوازەو عوسمان ئەو کارەی وەك بڕیارێکی تاکەکەسی نەکردووەو کۆدەنگی هاوەڵانی لەسەر بووە، بەڵکو زیاتر لە ژێر فشاری هاوەڵاندا ئەو کارەی کرد، کاتێك ئاگاداریان کردەوە کە لە زۆربەی ئەو ناوچانەی فەتح کرابوون، کێشەی خیلاف هەیە لە نێوان موسڵماناندا لە خوێندنەوەی قورئانی پیرۆزدا و باشتر وایە کە قورئانی پیرۆز بە یەك شێوازی یەکگرتوو بنووسرێتەوەو موسڵمانانی لەسەر کۆبکرێتەوە، عوسمانی کوڕی عەفانیش پێشنیارەکەی بەلاوە باش بوو، بۆیە ئەو بڕیارەی دا، تەنانەت عەلی کوڕی ئەبو تالب دەڵێ خەڵکینە بۆ ئەوەندە باس لەو کارەی عوسمان دەکەن کە گوایە

مەصحەفی سووتاندووە، بەڵکو ئەو کارە بە کۆدەنگیی هەموو هاوەڵان کراوە، ئەگەر منیش لە جێگەی عوسمان بوومایە، هەر وام دەکرد[٣٤].

**دووەم:** ئەو گومانەی کە ڕۆژهەلاتناسان دەیوروژێنن کە گوایە ڕێبازی عوسمانی کوڕی عەفان لە کۆکردنەوەی قورئانی پیرۆزدا زیاتر مەنهەجێکی ئەرستۆکراتی پێوە دیارە و سێ لەو چوار کەسەی لیژنەکە قوڕەیشین و تەنها زەید قوڕەیشی نییە، ئەمەش زیاتر فەزڵی قوڕەیش و عەشرەتەکەی خۆیەتی بۆ ئەو پرۆسە گرنگە!، ئەم بۆچوونە بەهێز نییە و زیاتر وەك گومان دروستکراوە، چونکە ئەو چوار کەسە لە نووسەرانی وەحی بوون و بەتایبەتی زەید ئاگاداری دوا خوێندنەوەی پێغەمبەر بووە لە دوا ڕەمەزانی تەمەنی پێغەمبەردا، کە دوو جار بۆ جبریلی خوێندووەتەوە، بەشدارینەکردنی نووسەرانی ئەنصاریش لەو پرۆسەیەدا هۆیەکەی ئەوە بووە کە هاوەڵان بلاوەیان کردووە بە ناوچە جیاوازەکانی فەتحکراوی موسڵماناندا، لە عێراق و وڵاتی فارس و شوێنەکانی تر و لەو کاتەدا لە شاری مەدینەدا نەبوون هەتا بەشداریی ئەو کارە گرنگە بکەن[٣٥].

٣٤ - ینظر: د.فضل حسن عباس، اتقان البرهان في علوم القرآن، م١، ص٢٧٨.

٣٥- ینظر: د. فضل حسن عباس، اتقان البرهان في علوم القرآن، ج١، ص٢٩٦-٢٩٧.

# کۆتایی توێژینەوە

دوای ئەم توێژینەوەیە و تاوتوێکردنی ئەو نووسین و لێکۆڵینەوانەی لە بواری مێژووی نووسینەوەو کۆکردنەوەی قورئانی پیرۆزدا نووسراون، دەگەینە ئەو ئەنجامەی کە قورئانی پیرۆز هەر لە سەرەتای دابەزینیەوە بۆ پێغەمبەری خوا، لەبەر کراوە لەلایەن موسڵمانانەوەو بە تایبەت پێغەمبەری خوا، لە هەمان کاتدا هەموو ساڵێك لە مانگی ڕەمەزاندا مەلائیکەی وەحی (حەزرەتی جبریل) قورئانی بۆ پێغەمبەر خوێندووەتەوە، لەگەڵ ئەوەشدا پێغەمبەر نووسەری وەحی هەبووەو، هەموو ئایەت و سورەتێك کە بۆی دابەزیوە، لەلایەن ئەو نووسەرانەوە نووسراوەتەوەو لە شوێنی تایبەتدا پارێزراوەو وەك گرنگترین کاری پێغەمبەر ئەو پرۆسەیە سەیر کراوە، جێگەی گرنگیپێدانی هەموو هاوەڵانیش بووە لە پێش کۆچی پێغەمبەر بۆ مەدینەو لە دوای کۆچیش.

کاتێك پێغەمبەر کۆچی دوایی دەکات، هەموو قورئان بە نووسراوی هەبووەو لەلایەن بەشێکی زۆری هاوەڵانیشەوە بە لەبەرکراوی لە سنگیاندا پارێزراوە، هەموو ئایەت و سورەتەکانی قورئانیش بە پلەی (تواتر) نووسراونەتەوە.

لە دوای کۆچی دوایی پێغەمبەر (دروودی خوای لەسەر بێت)، هەر یەك لە ئەبوبەکری صدیق و عومەری کوڕی خەتاب وەك یەکەم کاریان دەستیان کردووە بە کۆکردنەوەی قورئانی پیرۆز لە نووسراوو لەبەرکراوو لەناو دووتوێی یەك مەصحەفدا کۆیان کردووەتەوە، بەڵام بە خوێندنەوە جیاوازەکانەوەو بۆ ئەم پرۆسە گرنگە زەیدی کوڕی سابت کە نووسەری سەرەکیی وەحی پێغەمبەر بوو، ڕادەسپێرن و ئەویش لە قورئانی نووسراو و لەبەرکراو بە سەنەدی (تواتر) هەموو قورئان لە دووتوێی یەك مەصحەفدا کۆدەکاتەوە.

لە سەردەمی عوسمانی کوڕی عەفاندا بەهۆی فراوانبوونی سنوورەکانی دەسەڵاتی ئیسلامی و هاتنی نەتەوە جیاوازەکان و موسڵمانبوونیان، کە زۆربەیان لە نەتەوە ناعەرەبەکان بوون و شارەزای زمانی عەرەبی نەبوون، ئەمەش دەبووە

هۆی دروستبوونی کێشە لە نێوانیاندا، جا بۆ ئەوەی سنووری جیاوازییەکان کەم بکرێتەوەو دووبەرەکی لە ناو موسڵماناندا دروست نەبێت، عوسمانی کوڕی عەفان لیژنەیەك لە هاوەڵان هەڵدەبژێرێت کە قورئانی بە یەك خوێندنەوەو بەیەك ڕەسم لەناو یەك مەصحەفدا بۆ بنووسنەوە، ئەوانیش پرۆسەکە تەواو دەکەن و چەند مەصحەفێك لەبەر ئەو مەصحەفە دەنووسنەوەو دەینێرن بۆ ناوچە جیاوازەکانی جیهانی ئیسلامی و قورئانی پیرۆز دوا وێنەی خۆی وەردەگرێت، ئەم پرۆسەیەش کۆدەنگیی موسڵمانانی لەسەر بووەو کێشەی فرەجۆریی خوێندنەوەو دروستبوونی جیاوازیی کۆتایی پێهێناوەو هەموو موسڵمانان هەتا ئەمڕۆ لەسەری کۆبوونەتەوە.

## خاتمة البحث:

## شبهات المستشرقين عن كتابة وجمع القرآن الكريم

اعتنى النبي ﷺ ومن بعده صحابته الكرام عناية كبيرة بالقرآن الكريم من حيث كتابته على الرقاع والأشجار والأحجار واللحاف، وحفظه في الصدور وفي السطور، إن القرآن الكريم كتب في عصر النبوة والرسالة، وللرسول ﷺ كتبة الوحي في عهدي المكي والمدني، ما أنزل الله آية وإلا كتب من قبل هؤلاء بأمر من الرسول ﷺ، أجمع علماء الأمة أن بعد وفاة النبي ﷺ القرآن الكريم كله مكتوب في السطور و محفوظ في الصدور.

وبعد واقعة اليمامة واستشهاد بعض حفظة القرآن الكريم يخشى عمر بن الخطاب رضي الله عنه من ضياع أو فقدان أو شك في بعض آيات القرآن الكريم باستشهاد أو وفاة بعض الصحابة الذين يشهدون نزول القرآن الكريم وكتابته وحفظه، لذلك اجتمع مع أبي بكر الصديق وشاوره عن جمع القرآن الكريم وكتابته في مصحف واحد، بعد تبادل بعض آراء اتفقا على كتابة القرآن الكريم وجمعه في مصحف واحد، واختارا لهذا الأمر العظيم بعض الصحابة وقاموا بهذه المهمة وجمعوا القرآن الكريم حسب ترتيب المصحف، ثم جاء بعدهما عثمان بن عفان رضي الله عنه جمع القرآن الكريم على مصحف واحد وبرسم واحد وانتهى جمع أخير للقرآن الكريم، واتفق جميع الصحابة على مصحف عثمان رضي الله عنه.

وبعد ظهور الاستشراق ومحاولاتهم في الدراسات عن الاسلام وتأريخه وكتابه وسنة نبيه ﷺ وكتبوا عن القرآن الكريم وجمعه وحاولوا في تشكيك عن جمع القرآن، ولكن عملية جمع القرآن مرّ بمراحل دقيقة والمنهج العلمي المتبع في الشريعة الاسلامية وهي التوثيق والتواتر بنوع حتى لا يكون هناك مكان للشك والريب في أي زمان ومكان، وجاءت محاولاتهم بالفشل، وهذه المحاولات الاستشراقية دفعت بالمسلمين للدراسة والبحث أكثر عن القرآن الكريم وجمعه وكتابته وازداد ايمانهم بالقرآن الكريم وعملية جمعه والمنهج المتبع من قبل الصحابة لكتابة القرآن الكريم وتدوينه في مصحف واحد.

# سەرچاوەكان:

١ـ القرآن الكريم.

٢ـ أحمد بن علي بن محمد ابن حجر العسقلاني، شهاب الدين، الاصابة في تميز الصحابة، تحقيق علي محمد البجاوي، الطبعة الأولى ١٤١٢هـ ١٩٩٢م، دار الجيل ـ بيروت.

٣ـ احمد نصري، الدكتور، آراء المستشرقين الفرنسيين في القرآن الكريم، الطبعة الأولى ٢٠٠٩م، دار القلم ـ الرباط.

٤ـ إسماعيل بن عمر بن كثير بن ضوء بن كثير، القرشي الدمشقي الشافعي الحافظ ابن كثير، تفسير القرآن العظيم، تحقيق: دكتور السيد محمد السيد و دكتور وجيه محمد احمد و مصطفى فتحي عبدالحكيم و سيد ابراهيم صادق، الطبعة الأولى ١٤٢٣هـ ٢٠٠٢م، دار الحديث ـ القاهرة.

٥ـ أكرم ضياء العمري، الدكتور، السيرة النبوية الصحيحة، الطبعة الثامنة ١٤٣٠هـ ٢٠٠٩م، مكتبة العبيكان، الرياض.

٦ـ تيودور نولدكة، تاريخ القرآن، تعريب د.جورج تامر مع فريق عمل السيدة عبلة معلوف ود، خيرالدين عبدالهادي و د. نيقولا ابو مراد، تعتمد هذه الطبعة على الطبعة الرابعة، بغداد ٢٠٠٨م، منشورات الجمل.

٧ـ عبدالرحمن جلال الدين السيوطي، الاتقان في علوم القرآن، تحقيق احمد بن علي، بدون عدد الطبع، ١٤٢٥هـ٢٠٠٤م، دار الحديث ـ القاهرة.

٨ـ عبدالرحمن عمر محمد اسبينداري، كتابة القرآن الكريم في العهد المكي، الطبعة الأولى ١٤٢٣هـ٢٠٠٢م، من منشورات المنظمة الاسلامية للتربية والعلوم والثقافة، المملكة المغريبية.

٩ـ عبدالله ابن قدامة المقدسي، موفّق الدين، الإستبصار في نسب الصحابة الأنصار، تحقيق علي نويهض، الطبعة الأولى, ١٣٩١هـ ـ دار الفكر ـ بيروت.

١٠ـ عبدالله بن سليمان بن الأشعث السجستاني الحنبلي، ابو بكر، المعروف بـ ابن أبي داود، كتاب المصاحف، تحقيق الدكتور محب الدين عبدالسبحان واعظ، الطبعة الأولى ١٤١٥هـ ١٩٩٥م، دار البشائر الإسلامية الأولى، بيروت ـ لبنان.

١١ـ عبدالصبور شاهين، الدكتور، تاريخ القرآن، بدون عدد الطبع، دار القلم ١٩٦٦.

١٢ـ فضل حسن عباس، الدكتور، اتقان البرهان في علوم القرآن، الطبعة الثانية ١٤٣٠هـ ـ٢٠١٠م، دار النفائس ـ الأردن.

١٣ـ فهد بن عبدالرحمن بن سليمان الرومي، الدكتور، دراسات في علوم القرآن، الطبعة السابعة عشر ١٤٣٢هـ ٢٠١١م، الرياض.

١٤ـ محمد بن اسماعيل البخاري، صحيح البخاري، تقديم احمد شاكر و ترقيم محمد فؤاد عبدالباقي، الطبعة الأولى ١٤٢٥هـ ـ٢٠٠٤م، دار ابن الهيثم، القاهرة.

١٥ـ محمد بن علي بن أحمد بن حديدة الأنصاري، أبو عبد الله، لمصباح المضيء في كتاب النبي الأمي ورسله إلى ملوك الأرض من عربي وعجمى، تحقيق محمد عظيم الدين، دار النشر، عالم الكتب ـ بيروت ـ ١٤٠٥هـ.

١٦ـ محمد عبدالعظيم الزرقاني، مناهل العرفان في علوم القرآن، تحقيق فواز احمد زمرلي، الطبعة الأولى ١٤١٥هـ ١٩٩٥، دار الكتاب العربي.

١٧ـ محمد علي الشوكانى، فتح القدير الجامع بين فني الرواية والدراية من علم التفسير، حققه وخرج أحاديثه وفهرسها سيد ابراهيم، الطبعة الأولى ١٤١٣هـ ١٩٩٣م، دار الحديث—القاهرة.

١٨ـ محمد محمد أبو ليلة، الدكتور، القرآن الكريم من المنظور الاستشراقي دراسة نقدية تحليلية، الطبعة الأولى ١٤٢٣هـ ٢٠٠٢م، دار النشر للجامعات، مصر.

١٩ـ مسلم بن الحجاج النيسابوري، صحيح مسلم، تحقيق الشيخ خليل مأمون شيحا، الطبعة الأولى، ١٤٢٦هـ ٢٠٠٥م، دار المعرفة، بيروت ـ لبنان.

٢٠ـ موسى ابراهيم الابراهيم، الدكتور، بحوث منهجية في علوم القرآن الكريم، الطبعة الثانية ١٤١٦هـ ١٩٩٦، دار عمار، عمان.

# چۆن قورئان بخوێنینەوە و بە وردی لێی تێبگەین؟

خودای گەورە ڕوونی کردووەتەوە کە بێگومان ئەم پەرتووکە پیرۆز و فەڕدارە. مانای ئەم پیرۆزییەشی لە وردخوێندنەوە و ناوهێنانیایەتی. وردخوێندنەوە چێژ و تـامێکی هزریـی نییـە، یـان چـوونە نـاو وڕێنـە و قسـەی بێمانـا و تـەئویلاتی باتینییەکانەوە، یان تەنها بۆ زیادە زانـین و زانیـاری، وردخوێندنـەوە تێڕامـان و بیرلێکردنەوەیە، هەندێ کات وێناکردنی ئامانجی کۆتـایی و پاشـەکیی ئایەتەکەیـە نەك ڕازییبوون بە ڕاڤەکردنی وشە و ئایەتەکان. هەندێك لە نزیککارییە مێـژوویی و هاوچـەرخەکانی وردخوێندنـەوە "بـە سـێبەر و کـەش و خـاترە یـان راڤـە و ڕوونکردنەوە و تەئویل ناونراوە".

لە سورەتی "المؤمنـون"دا لـە ئایـەتی ژمـارە "٦٩ ـ ٧٠" دا، سەرزەنشـتێکی توند بەدی دەکەین بەرامبەر بە کەمتەرخەمی نواندن و لانەکردنـەوە بـەلای وتـارە قورئانییەکاندا لەناو ئـاپۆڕە و قـەرەباڵغیی ڕووداو و هزرەکانـدا، یـان نووسـان بـە رابوردوو و سەرچاوە مێژووییەکانەوە.

(أَفَلَمْ يَدَّبَّرُوا الْقَوْلَ أَمْ جَاءهُم مَّا لَمْ يَأْتِ آبَـاءهُمُ الْـأَوَّلِينَ) (المؤمنـون: ٦٨)، واتـە: تەعەجوب دەکرێ لە حاڵی ئەو کافرانەی قورەیش! ئایا باش بیریان نەکردەوە لەو فەرموودەی خودا کە قورئانـە، هـەتا بـاش تێبگـەن کـەوا ڕاسـتە؟ یـان نـەخێر بـە شیاوی تێفکرینی نازانن، لەبەرئەوە کەلامێ هـاتووە بـۆ لایـان کـە هـاتووە بـۆ لای باوباپیرە پێشینانەکانیان.

گوێیان نەدایە ئەم پەرتووکە سەرەڕای تازەگەرییەکەی (مَا يَأْتِيهِم مِّن ذِكْـرٍ مَّـن رَّبِّهِم مُّحْدَثٍ إِلَّا اسْـتَمَعُوهُ وَهُـمْ يَلْعَبُـونَ) (الأنبيـاء: ٢)، واتـە: ئایـەتێك نایـەت لـەلای خودای میهرەبانەوە بـە تـازەیی، ئـیللا ئـەوان گـوێی بـۆ دەگـرن، کەچـی گاڵتـەی پێدەکەن.

ئەوان یان لە دۆخی عەزیەت و شەکەتی و گۆڕینی چالاکیی جەستەییدان، یـان لە دۆخی سـەرگەرمییەکی دڵیـدان بـە گرنگییـدان بـە شـتەکانی زەوی و خۆشـی و

چێژه زوو بەسەرچووەكانی. پاشان خودای گەورە لـە شـاری مەدینـە ئایـەتی نـاو سورەتی "نساء" ی ناردە خوارەوە (أَفَلاَ يَتَدَبَّرُونَ الْقُرْآنَ وَلَوْ كَانَ مِنْ عِندِ غَيْـرِ اللّـهِ لَوَجَدُواْ فِيهِ اخْتِلاَفاً كَثِيراً) (النسـاء: ٨٢) واتـە: ئـەوە بـۆ ئەوانـە سـەرنجی قورئـان نادەن و لێكی نادەنەوە و لێی وردنابنەوە؟ خۆ ئەگەر لـە لایـەن كەسـێكی تـرەوە بوایە جگە لە خوا، بێگومان جیاوازی و دژایەتییەكی زۆریان تێدا دەدۆزییەوە.

ئەم ئایەتە پیرۆزە لۆمە و سەركۆنەی گرووپێك دەكات كە سەرگەرمن بە كـاری جیهانییەوە "دنیاییەوە"، یان هیچ حسابێك بۆ قورئـان ناكـەن، یـان نـازانن كـاتی لەگەڵدا بەرنەسەر بۆ بیرلێكردنەوەی، یـان گومانیـان هەیـە كـە لـە لایـەن خـوداوە هاتبێت.

بەڵگـە دێنێتــەوە بۆیـان و بانگیـان دەكـات بـۆ بـەراوردكردن و لێكۆڵینـەوە و پشكنینی ناوەكی. ئەگەر قورئانی پیرۆز هەڵقوڵاو و وەرگیراوی كەلەپووری كۆن و كتێبە دەستاودەست پێكراو و باوەكان بوایـە، ئـەوا جیـاوازی و دژبەیـەكبوونێكی زۆریان تێـدا دەبینـی، كـە دەبـووە تانـە و پرسـیار و گومـان لەسـەر ڕاسـتیەتی و بابەتیبوونی وتاری... كەوا پشت هەڵكردن لە قورئان چارەسەر نییە، خۆ گێـل و نـەزان كـردن لێـی لـە نێـوان هـەموو پـەرتووك و نامـەو "یاداشـتنامە" و گۆڤـار و لاپــەڕەكانی ئەنتــەرنێت و "فەیســبووك"دا، چارەســەر و دەرچــوون نییــە لــەم "تەڵەزگە" هزرییەی كە جیهانی ئێستەمانی تێدا دەژی...

هیچ دژایەتی و ناتەباییەك لە نێوان قورئـان و ئـاڵوگۆڕە بـە سـوودە فیكـری و بابەتییــەكانی تــەكنۆلۆجیای هاوچــەرخدا نییــە، بــە مــەرجێك نەبنــە هۆكــاری لەبیربردنەوەی قورئان یان پشت گوێخستنی. پاشان لە سورەتی "محمد" ئایـەتی ژمارە"٢٤" هاتە خوارەوە (أَفَلَا يَتَدَبَّرُونَ الْقُرْآنَ أَمْ عَلَى قُلُوبٍ أَقْفَالُهَا) (محمد: ٢٤)، واتە: ئایا ئەوە بۆچی وردبینی لە قورئاندا ناكەن و گوێی بـۆ نـاگرن، یـان ئەوەیـە دڵەكان لە ئاستی ڕاستیدا قفڵ كراون. لە لۆمە و بناشتێكی تردا بـۆ ئـەم گرووپـە، باسی باردۆخی و لەمپـەری ڕێگـەی بیركردنـەوەی لـە ئایەتـەكان كـە داخسـتنێكی

یــەکجارەکیی مەڵبەنــدی وەرگــرتن و وەلامدانەوەیــە، کــە ئــەویش دڵــە، پاشگەزبوونەوەیەکی بەئەنقەستە لە قورئان، لەبەر چەند هۆکارێك کە ناونـەبراون، لەوانەیـە کـە سـەرگەرمییە هـزری و دەروونییەکانـە بـە رۆشـنبیری بـاو و بـیری هاوچەرخەوە بێت لەسەر حیسابی بیرکردنەوە لە ئاسۆکانی قورئان یان ڕاکردنێکی تینوانە بێت بە دوای چێژ و قازانج و هێز و ئارەزوو و داخوازییـە دەروونییەکانـدا. ئایەتە پیرۆزەکان بەیەکەوە بەستراون، لە چوارچێوەی داڕشـتنێکی گشـتیدا، وەك پێکەوە بەسترانی شێوە ئەندازەییەکان لە پارچەیەك خشڵی بە دەگمەن داڕێژراوی جوان گـیراوەی گونجـاو دابەشـبوودا، هـەروەك چـۆن چـەند وێنەیـەکی ئەنـدازەیی گرووپێك ئەستێرە لە بەشێك لە ئاسماندا دەدۆزینەوە.

پێویسـتە لـە سـەرمان بەشـە ناوەکییـەکانی قورئـان لـە هـەموو ئایـەت و سورەتێکدا پێکەوە ببەستینەوە، تا پەیوەندییە ناوەکییەکانی قورئانمـان لا روون بێت... وەك دەزانن یەکەیەك یان چەند یەکەیـەکی بابـەتی یـا چـەند بەشـێکی لـە قورئاندا هەیە. (الَر كِتَابٌ أُحْكِمَتْ آيَاتُهُ ثُمَّ فُصِّلَتْ مِن لَّدُنْ حَكِيمٍ خَبِيرٍ) (هـود: ١)، یان بۆ نموونە بەندێك لە بارەی نادیـارەوە، یـان ژنـەوە، یـان لـە خـوا ترسـی یـان کاربـەجێی، یـا نێـردراو و جگـە لەمانـە.. بێگومـان کـە فێربـوونی قورئـان و چـاك خوێندنـەوەی و لەبـەرکردنی، دەروازەیـەکی سـەرەتایی و رێگایـەکی بـەربڵاوە و پەسـەندە بـۆ مامەڵـەکردن لەگـەڵ قورئانـدا. هـەموو ئەمانـەش جێگـەی ئـەو بـیر لێکردنـەوە و تێڕامانـە ناگرێتـەوە کـە دەتگەیەنێتـە ئـەو ڕاسـتییەی کـە قورئـان دەستی تێوەنەدراوە و جێگۆڕکێ لە وشـەکانیدا نـەکراوە، پێغەمبـەر دەسـتکاریی نەکردووە، نە بە زیاد کردن یان کەمکردن....و قورئان شتی پڕوپـووچ و ئەفسـانە و گێڕانەوەی مێژوویی گوماناوی و هونەری و چیرۆکی هەڵبەستراوی تێدا نییە.

(وَاتْلُ مَا أُوحِيَ إِلَيْكَ مِن كِتَابِ رَبِّكَ لَا مُبَـدِّلَ لِكَلِمَاتِـهِ وَلَـن تَجِـدَ مِـن دُونِـهِ مُلْتَحَـداً) (الكهـف: ٢٧)، واتــە: ئــەی موحەممــەد ئــەوەی بــە وەحــی بــۆ تــۆ لــە قورئــانی پەروەرگارت ڕەوانەکراوە، دەوری بکەرەوە، هیچ کەس نییە فەرموودە و گوفتاری

ئەو زاتە بگۆڕێت، دڵنیاش بە کە هەرگیز پەناگا و یاریدەدەرێکی وەکو ئـەو زاتـەت دەستناکەوێت.

خوێندنــەوە بڵاوەکـانی "الشـائعة" قورئـان چارەسـەرێك بـوو بـۆ کێشـەی شێوەزارە جۆربەجۆرەکان و خاڵدار نەبوونی پیتەکانی، کە بێگومـان قورئانەکـەی عوسمان "ڕەزای خوای لێ بێت" کۆتایی پێهێنا...

ئـەم هۆکارانـە نەمانـەوە تـا هەنـدێ نووسـەری نوێخـواز یـان ڕۆژهـەڵاتناس "المستشرق" بیکەنە رێگە و بیانویەك بـۆ تانـەدان لـە ڕاسـتیەتی یـان یـەکبوون و دوور لـە ناتـەواویی دەقـە قورئانییـەکان... ملکـەچ نـەبوونیان بـۆ گۆڕانکـاری لـە باڵەخانە بێژەییەکەیدا.

لــە بیرمـان نەچـێت کـە تێڕامـان و بیرلێکردنـەوە تـەنها هزرێکـی تیـۆری "تیۆرومایی" نییە لە ئایەتەکەدا، بەڵکو دەبێتە هۆی بنیاتنانی چەند رێکخراوێکـی کــرداری لەســەر دراوی "المعطــی" قورئــانی و پلانــدانان بــۆ ژیــان و ڕووە کردارییەکانی. ئەگەر بابەت بانگکردنی ئاوەز بێت، هەروا خوێنەر تێپەڕ نابێـت بـە سەریدا، بەڵکو عەقڵ بەکاردێنێ، ئەگەر بۆ بیرکردنەوەش بوو، بیردەکاتـەوە. ئـەم دوو کـارەش دیـارە جیـاوازن، ئەگـەر نادیـاربوو بـاوەڕی پێـدێنێ وەك نادیـارێکی نەدۆزراوە و یان کات ئاشکرای دەکات، یان بیریارێك بوو لە ژیان و دامەزراوەکانی بڕیاری پێدەداو دوای ناخات و بەهانەی بۆ ناهێنێتەوە، گومانی تێدا ناکـات، یـان چـیرۆکی کـورتکراوە و چـەند بەشـێکی تۆکمـە و وانەگـەلێکی کـە پێویسـتە بـیری لێبکرێتەوە و پەندی لێوەربگیرێت، یان چەند ئایەتی "موتەشابیهن" شوێنی راڤـە و لێکۆڵینەوەی ناکەوێت بۆ لادانی کەسی تـر یـان تـەئویلکردنی و لادانـی لـە واتـا بنەڕەتییەکەی... هتد، هــەر وەك "حەسـەنی بەسـری" فـەرمووی "تـدبر ايات الله

اتباعهـا" واتــه: بیرکردنــەوە و تێڕامــان لــە فــەرمودەکانی خــوای گــەورە، شوێنکەوتنیانە".[1]

براکەم.. خوشکەکەم، بگەڕێوە بۆ بیرکردنەوە و وردبوونەوە لـە قورئـان، ئـیتر هـیچ ڕاجیاییـەك نابینیـت تووشـی ترسـت بکـات لـە سـاغیی بیرکردنـەوەت، یـان گومانێك ببێتە هۆی لەکیسچوونت یا سەرسامیت. قورئان و ئایەتەکانی ناتەبا و دژ نـین لەگـەڵ واقیـع و "الممکـن"دا و موسـتەحیل و نـەبووی تێـدا نییـە، بـەڵام بەدووربوون پێویسـتە لـە سـۆزە مرۆییەیـە سـەرکەش و ئـارەزوو و گریمانـەکردنی بیردۆزە گریمانەییەکان.

کاتێ پێت دەڵێ کە جیهان خوایەکی هەیە، هـەوڵ مـەدە وێنـای بکـەی، لەبـەر ئەوەی وێناکردنەکانی تۆ لە واقیعێکی سنووردار و ئـەزموونێکی کـەم و زانینێکـی بەر هەستی تەسك وەرگیراون، یان پێت دەڵێن کە لەوێ "تـەوجیهات" بەهەشـتێك ئامـادەکراوە، مـەرج نییـە هــەموو شـتێك لـەبارەی شـوێن و پێگـە و چـۆنیەتی ئامادەکردن و دروستکردنی پێکهاتەکانی بزانین، پێوانەکردن لەسەر نادیار و بـزر، جگە لەوەی کە نیگا "الوحي" هەواڵی لێوە داوە "باسی کردووە"، بەڕاستی مـرۆڤ توانیویـەتی زۆر لـە شـتەکان دروسـت بکـات کـە ئـەو "خـۆی دروسـت کردنـی خودایە"... هەروەها ئەو ئاگرەی بـۆ بێبـاوەڕان ئامـادەکراوە کـە نـازانین چـۆنە؟ چـۆن فریشـتەکان سەرپەرشـتی کـاری شـکەنجەدان دەکـەن؟ چـەند جـار ئەمـە ڕوودەدات؟ هەندێ جار سـزا چـەند قاتێك دەبێـت، گـرنگ ئەوەیـە بـزانین کەسـێ دەچـێتە ناویـەوە شـیاوی ئـەو شـوێنەیە، لەبـەر ئـەوەی ئەگـەر بیشـی بینـێ دەگەڕێتەوە سەر هەمان کردەوەی ژیانی جیهـانیی جـارانی (بَـلْ بَـدَا لَهُـم مَّـا كَـانُواْ يُخْفُونَ مِن قَبْلُ وَلَوْ رُدُّواْ لَعَادُواْ لِمَـا نُهُـواْ عَنْـهُ وَإِنَّهُـمْ لَكَـاذِبُونَ) (الأنعـام: ٢٨)، واتـە:

١ـ تەفسیری قورتوبی، بەرگی ٨، ل٥٥.

ئەگەر بگێڕدرانایەتەوە بۆ دنیا هەر دەگەڕانەوە سەر ئەو کوفر و نامەردییە کە لێی مەنع کران. کە ئەمەش کارێکی سەرسوڕهێنەرە.

هەروەها "راغبی ئەصفەهانی" وشەی" الخلود، الابدیة"ی بە واتای ماوەیەکی درێـژ ڕاڤـەکردووە، "ابـن القـیم" لـە پـەرتووکی "الصـواعق الرسـلة"دا وشـەی "الاحقاب" بە ٨٠ ساڵ راڤە کردووە، چەند بەڵگەیـەکی لەسـەر نەمانـەوەی دۆزەخ ڕیز کردووە، بەڵام هەندێك زانا بە مانەوەی هەمیشەیی دەدەنە قەڵەم.

قورئان هەندێکی پێچەوانەی هەندێکی تری نییە، هەروەك لـە دەقـە شـیعری و پەخشانە وتارییەکاندا دەبینرێ لە ئاستی جێبەجێ کـردن و راسـتگۆیەتی تـەواودا لە دەربڕیندا، سەرەڕای پێشکەوتنی سەردەمەکانو بەرەوپێشچوونی زانیـاری، لـە ناوەرۆکدا هیچ دژ بە یەکبوونێکی تێدا نییە... هەندێك وا گومان دەبەن کە قورئان جیاوازیی تێدایە، لەوەدا کـە بانگـەواز دەکـات بـۆ ئاوەدانکردنـەوەی سـەرزەوی و جێنشـینیەتی تێیـدا، کەچـی لەولاشـەوە، باسـی پایـە نزمیـی زەوی دەکـات و بـە هۆکاری فریودانی ناو دەبات، کە ئەمەش دیارە لەبەر هاوکێشەی چـالاکیی مرۆڤـی و هاوسەنگیەتی لە نێوان ژیانی دنیا و ڕۆژی دوایی، نادیار و دیار، هەست و دڵدا، نەك بۆ وازهێنان لە دینـا و دوورەپـەرێزی لـە شـتەکانی. پێشـەوا غـەزالی کۆمـەڵی بەڵگە دێنێ لەسەر وتاری شیعری کە چۆن جاری وا هەیە زۆر بێنرخـە یـان لاوازە، یان شڵەژاو و ئاڵۆزە، یان گران و هـەر وشـەکاری "المبالغـة" تێـدا کـراوە و ڕەش بینە یان ئارەزووە بەلای شتێکدا، یان پشت تێکردنیەتی.

لە قورئانی پیرۆزدا شتێك لەو شـێوەیە بـەدی ناکـەین وەك نموونەیـەك لەسـەر بابەتیبوونی، کـە هەنـدێ کـات کاریگـەریی غـەم و پـەژارەی پێغەمبـەر و ڕووداو و گۆڕانکارییەکانی "سەرەڕای گرنگییان" ژیانیی تێدا نابینن، بەڵکو لە بارەی ژیانی یوسف و موسا پێغەمبەرەوە بە درێژی باس دەکات، کە لـە بـارەی پێغەمبـەرەوە "دروودی خوای لەسـەر بێـت" "بـەم شـێوەیە نـادوێ". ئـەوەی دەبێتـە بـەرگر و لەمپەر لەبەردەم وردبوونەوە لە قورئانـدا، ئەوەیـە کەسـێك وەرناگرێـت کـە تـەنها

بـاوەڕی بـە بەرهەسـتکەوتوو "الحسـات" و بـیری مرۆڤـی دانـراو و بیروبـاوەڕە هەڵوەشاوەکانی هەبێت، کە ئەو کاتە پەردەیەکی نەبینراو بەدی دەکرێ و دەبێتە داپۆشەر بۆ وتارە قورئانییەکان و ڕێگر لەبـەردەم پەیوەنـدییان لەگـەڵ دڵەکانـدا. (وَإِذَا قَرَأْتَ الْقُرآنَ جَعَلْنَا بَيْنَكَ وَبَيْنَ الَّذِينَ لاَ يُؤْمِنُونَ بِالآخِرَةِ حِجَاباً مَّسْتُوراً) (الإسراء: ٤٥) واتە: هەر کاتێك قورئانت خوێند پەردەیەك دروست دەکـەین لـە نێـوان تـۆ و بێباوەڕاندا، ئەوانەی کە بڕوایان بە ڕۆژی دوایی نییە.

چونکە بێبڕواکان خۆیان دەڵێن تووشی بارودۆخ و ڕێگرێك بوون کە ناهێڵێت لە قورئان و لەگەڵتدا سوودمەند بن. (وَقَالُوا قُلُوبُنَا فِي أَكِنَّةٍ مِّمَّا تَدْعُونَا إِلَيْهِ وَفِي آذَانِنَا وَقْرٌ وَمِن بَيْنِنَا وَبَيْنِكَ حِجَابٌ فَاعْمَلْ إِنَّنَا عَامِلُونَ) (فصلت: ٥)[٢] واتە: ئێمە دڵەکانمان داپۆشراوە لە ئاستی ئەم بەرنامەیەدا کە تۆ بانگی ئێمە دەکەی بۆ لای، گوێشـمان کەڕ و قورسە لە ئاستیدا، لە نێوان ئێمە و تۆدا پەردە و بەربەست هەیە، تۆ هەوڵ و کۆششی خۆت بدە بێگومان ئێمەش هەوڵ و کۆششی خۆمان دەدەین.

مانا و هۆکاری ئەم وەسـفکردنەی ناونـەبردووە، دڵـەکان مەسـت و داخـراون و مۆریان پێدانراوە، بەهۆی ڕوانینی مادديگەرانە بۆ ژیـانو زانیـاری و ئـەو نیگایـەی کـە دانـی پێـدا نابێـت، بابـەتی بانگـەوازی ناچـێتە دڵەکانیانـەوە، کـە هـۆی ئـەوە هەندێکجار ئارەزوو و شوێنکەوتنی لە ڕادە بەدەری ئارەزووەکان و ئەو تاوانانەیـە کـە دڵ داخ دەکـەن بـە ئـاگری ئـارەزووی خۆشەویسـتیی دنیـایی. لوتبـەرزی لـە بیستنی بابـەتێك ئـارەزوو ناورووژێنـێ و داخوازیـە دەروونییـەکان نـادوێنێ، ڕێگـە خۆشـکەر نییـە بـۆ شـکۆی کەسـی و نەتـەوەیی و خێزانـی و چـینی تایفـەیی "هۆزگەرایی"... گوێکان نۆتـە مۆسـیقی و هەسـت بـزوێن و ئـارەزوو وروژێنـەکان دەبیستن، چاویش وشەکانی خوا نابینێت و نانۆڕێ بۆ کەسێ کە بەم وشانە قسەی لەگـەڵ دەکـات، چـونکە لـە نێـوان ئـەو و وتـەکانی خـوای گـەورەی دادپـەروەردا

---

[٢] ـ فصلت: ٥.

لەمپەری شتە خۆش و بینراوەکان بەدی دەکرێت. هەندێك زانا دڵ دەچوێنن بە ئاوێنە، کە ئەگەر تۆز و غوباری بەسەرەوە نەبوو و پاك بوو، وێنەی واقیع وەك خۆی نیشان دەدات، بە هەمان شێوە ئەو ڕاستییەی کە پێناسەیەکی ڕاستەقینەی واقیعە، دەبێتە مۆرك لەسەر دڵ، ئەگەر دووربوو لە کاری ئاژاوەگێڕی و پەڕاگەندەیی و بێهودەیی "بێ ئامانجی" و دوور بوو لە نەخۆشی و لادان "لاتەریب بوون".

لە عوسمانی کوڕی "عەففان"ەوە گێڕدراوەتەوە کە فەرموویەتی: "لو طهرت قلوبنا طاشبعت من كلام الله"[٣]. واتە: ئەگەر دڵەکانمان پاکبوایەتەوە ئەوا لە فەرمودەی خودا تێر نەدەبوون.

بە ڕاستی لە هۆکارەکانی دووبەرەکیی موسڵمانان کەم بیرکردنەوە و وردنەبوونەوەیە لە قورئان و خێرا تێپەڕبوونە بەسەریدا و خوێندنەوەیەتی بۆ پیرۆزیی پیتەکانی و هەوڵ نەدانە بۆ زیندووکردنەوەی خواست و ئامانجی ئایەتەکان، لە هزر و هەست و جموجوڵە کۆمەڵایەتی و رامیاری و ئابوورییەکاندا... لەبەرئەوە پێشەوا "شاطبی" دەفەرموێ (اذا حصل التدبر لم يوجد في القران اختلاف البتة)[٤] (ئەگەر بیرکردنەوە و وردبوونەوە هەبوو لە خوێندنەوەی قورئاندا، دووبەرەکی هەرگیز سەرهەڵنادات).

لە هۆکارەکانی ڕاجیاوازی، هەندێك گومانیان بردووە کە قورئان "ڕوو ناوی هەیە" دیوی دەرەوەو ناوەوەی هەیە، بە پشتبەستن بە فەرمودەیەك، بە کۆتاییەکەی، کە بەشە کۆتاییەکەی ساغنەبووەتەوە کە فەرموودە بێت بە لای کەمەوە، (أنزل القران على سبعة أحرف لكل اية منها ظهرو بطن). پێشەوا شاتبی لەسەر گریمانەی ڕاستبوونی "هیچ" بوونی فەرموودە کە دەڵێ "مەبەست لە

[٣] ـ احياء علوم الدين، الغزالي، ص٢٨٨.
[٤] ـ الموافقات، ج٣، ص٣٤٧ ـ ٣٧٥.

وشەی "ظاهر" چەمکە عەرەبییەکەیە، "باطن" یش مەبەستی خوایە لە قسە و وتارەکانیدا، جا ئەگەر کەسێك مەبەستی ئەم دوو واتایە بێت لە کاتی بەکارهێنانی دوو وشەی "ظاهر و باطن" دا، ئەوە ڕاستە و مشتومڕ هەڵناگرێت، ئەگەر مەبەستیان شتێکی تر بوو، ئەوا شتێکی زیادیان گوتووە کە لای هاوەڵانی پێغەمبەر و شوێنکەوتووانیان "التابعين" نابینرێت، ئەوا پێویستە بەڵگەیەکی حاشاهەڵنەگر هەبێت بۆ سەلماندنی ئەم داوایە "الدعول".

لەبەرئەوە یاسا و بەڵگەیە کە بڕیاری پێدەدرێ بەسەر قورئاندا و نابێت گومانی بێت "ظنی"..... بە دوو مەرج ڕێگە دەدری بە بوونی "باطن"، لە کاتێکا کە مەبەست پێی قسەی خوا و مەبەستی بێت، یەکەمیان: ڕاست و گونجاو بێت بەپێی خواستی ئاشکرا "الظاهر" و ئەوەی لە زمانی عەرەبیدا بڕیاری لێدراوە و دەگونجێ لەگەڵ ئامانجەکانی زماندا.

دووەمیان: دەبێت دەقێك بێتە بەڵگەی ڕاستیەتی و گەواهیی لەسەر بدات، بەبێ بوونی هیچ دژێك)[٥]. دکتۆر یوسف قەرزاوی و هەندێ لە زانایان ئینکاریی ئەوە دەکەن کە قورئان واتای ناوەکیی هەبێت پێچەوانەی چەمك و یاساکانی زمانی عەرەبی بێت.

بێگومان چەند ڕاڤەی "ناوەکی" لە قورئاندا سەری هەڵدا و بووە هۆی دووبەرەکی و پرژوبڵاویی هزری و ڕامیاری و ئاینزایی و بەڵکو تەنانەت لادان و لە دین دەرچوون لە هەندێ کاتدا... قورئان بە زمانێکی عەرەبی ئاشکرا هاتە خوارەوە و پڕاوپڕی ناونراوەکانە لەم زمانەدا، مەگەر گۆڕینی هەندێ کار، بۆ نموونە شێوەی نوێژ و ناوەڕۆکی و پاش ئەوەی کە بریتی بوو لە فیکە و چەپڵە لێدان...

---

٥ ـ الموافقات، ج٣، ص٣٤٧ ـ ٣٧٥.

ئەمەش ئەوە ناگەیەنێت، کە قورئان تایبەتمەندیی مانا فراوانیی وشەکانی تێدا نەبێت تا هەموو گریمانە زمانییەکان نەگرێتەوە، کەواتە قورئان هەندێ جار دۆزینەوە زانستی و داهێنانەکان دەبێتە ڕاڤە و تەفسیر لە بۆ ئامانج و مەبەست و ئاراستەکانی.

لەمەوە هەندێ نووسەر گومانی ئەوەیان بردووە کە قورئان چەند ڕوویەك هەڵدەگرێت، بە بەڵگەی ئەو فەرموودەیەی ئیمام عەلی: کە دەفەرموێ بە "ابن عباس"م وت: کاتێ ویستی موناقەشە لەگەڵ "خەواریج" بکات بە قورئان کە ئەو زۆر زانا بوو تێیدا "ڕاست دەکەی، بەڵام قورئان زۆر مانا دەگەیەنێت، دەڵێیت، دەڵێن، بەڵام بە سوننەت "فەرموودە" بەرەنگارییان بوەستە"[٦] وەکو گێڕدراوەتەوە، بەم شێوەیەی کرد لەگەڵ "خەواریج" دا و ئەوانیش بەڵگەیان پێ نەمایەوە "واتە بۆڕیان خوارد".... "طیب تزنینی" فەرموودەیەکی "تەخریج" نەکراوی هێناوە کە دکتۆر "سعید رمضان البوطی" ئینکاریی کردووە "دانی بە بوونیدا نەهێناوە".

کەواتە جێگرێك کە ڕاستە نامێنێتەوە وەك "راغبی ئەسفەهانی" دەیهێنێت... ئیللا ئایا فەرموودەش دیسان زۆر بڵاونەبووە کە ئەویش چەند ڕوویەك هەڵدەگرێت. (وَإِذَا تُتْلَى عَلَيْهِمْ آيَاتُنَا بَيِّنَاتٍ قَالَ الَّذِينَ لاَ يَرْجُونَ لِقَاءنَا ائْتِ بِقُرْآنٍ غَيْرِ هَـذَا أَوْ بَدِّلْهُ قُلْ مَا يَكُونُ لِي أَنْ أُبَدِّلَهُ مِن تِلْقَاء نَفْسِي إِنْ أَتَّبِعُ إِلاَّ مَا يُوحَى إِلَيَّ إِنِّي أَخَافُ إِنْ عَصَيْتُ رَبِّي عَذَابَ يَوْمٍ عَظِيمٍ) (یونس: ١٥). واتە: ئەی پێغەمبەری خۆشەویست تۆ بڵێ: ناکرێ کە ئایەتێك لەم قورئانە لە خۆمەوە بگۆڕم هەتا خودا ئەمرم پێنەکات، جا مادام ئایەتێکم پێ نەگۆڕدرێن، چۆن موککین دەبێ ئەم قورئانە بگۆڕم بە قورئانێکی تر؟

---

[٦] ـ کیف نتعامل مع القران، القرضاوي، ص٤٤.

من ناكەومە شوێن هیچ شتێك ئەوە نەبێ كە بە نیگا دێ، بـەڵام (وَتَمَّتْ كَلِمَتُ رَبِّكَ صِدْقاً وَعَدْلاً لاَّ مُبَدِّلِ لِكَلِمَاتِهِ وَهُوَ السَّمِيعُ الْعَلِيمُ) (الأنعام: ١١٥). واتە: بزانە كـە ئایەتی خودا كە نازڵ بووە بۆ لای تۆ، گەیشتووەتە سەر بەرزیی باڵا لـە راسـتی و دادگەریدا و لە میانەكاریدا، كەس ناتوانێت یەكێك لەو حوكمانە بگۆڕێت بـە چـاكتر لەوە، چونكە قسەی كەسێكە كـە هـەموو عـیلم و حیكمـەتێك لـەوەوە دەگـات بـە عالەم، یاخود كەس ناتوانێت كەلیماتی ئـەو كەلامـە بگـۆڕێ، چـونكە خـودا خـۆی پـارێزەری ئـەو كەلامەیـە و خـودا هـەموو شـتێك دەبیسـتێ و بـە هـەموو شـتێك دەزانێت.

(وَلَوْ تَقَوَّلَ عَلَيْنَا بَعْضَ الْأَقَاوِيلِ) (الحاقة: ٤٤). ئەگەر ئەو "موحەممەد"ە قسەی لەسـەر ئێمـە هەڵبەسـتایە و بـە ناڕاسـتی بـە نـاوی ئێمـەوە قسـەی بكردایـە. لـە خواستەكانی "مقتضات" وردبوونەوە و خوێندنەوە و كردارە یان نزیك خـەرەوەی سەردەمەكەیەتی كە پێی دەوترێت "جێبەجێكردن".....

كـردەوەی چـاك لەبـەرترە لـە واتـا گەیاندنـدا ئـەنجا جێبـەجێكردن، هـەروەها هوشداریدان "بیرهێنانەوە" و تێگەیشتنی ورد بۆ ئەو لێكۆڵینەوە درێژانەی كـە لـە چوارچێوەی سـەردەم و پێویسـتی و پرسـیار و داخوازییـەكانی بـەدەرن.... بـەم شێوەیە هەستی خوێنەر و هزر و وێناكردن و ڕا و گرنگیدانەكانی لـە چوارچـێوەی ئایەتەكانـدا دەمێننــەوە، یـان ئـەوەی كـە پێـی دەوترێـت خوێنــەوەی دەق بـۆ وەڵامدانەوە.

(يَا أَيُّهَا الَّذِينَ آمَنُواْ اسْتَجِيبُواْ لِلّهِ وَلِلرَّسُولِ إِذَا دَعَاكُم لِمَا يُحْيِيكُمْ وَاعْلَمُواْ أَنَّ اللّهَ يَحُولُ بَيْنَ الْمَرْءِ وَقَلْبِهِ وَأَنَّهُ إِلَيْهِ تُحْشَرُونَ) (الأنفـال: ٢٤). واتـە: ئـەی بـڕواداران وەڵامی خوا و پێغەمبەری خـوا بدەنـەوە كـە كاتێك بانگتـان دەكـات بـۆ لای ئـەو ئایینەی زیندووتان دەكاتەوە، بزانن ویسـتی خـوا بەربەسـتە لـە نێـوان ئـادەمی و دڵیـدا، بـە ڕاسـتی بـۆ لای ئـەو كـۆ دەكرێنـەوە. "الاسـتطراد" گشـتگیر بـوون لـە ڕاڤەكردندا پێویستە سنووری هەبێت... كورتهەڵهێنانی "الحصر" قورئان لە بۆنەی

مردوو و تەعزیەکاندا وای لێدەکات تەنها خۆڕاگری دروستکەرێك بێت لە بوارێکدا کە خەڵك بە تراژیدیای دەزانن و لێکنادرێتەوە بێجگە بە باوەڕبوون بە ڕۆژی دوایی نەبێت. بەکارهێنانی قورئان لە نوشتە و دوعا نووسیندا وای لێدەکات تەنها داڵدەی نەخۆش و موسیبەتزەدەکان بێت، کە لە ڕاستیدا "قورئان پەرتووکێکە بۆ ژیانی تاك و کۆمەڵ، خۆشی و ناخۆشی ئەو گیانە و "الروح" لە سەرمانە مامەڵەی لەگەڵدا بکەین وەك ڕاڤە و گیانێك بۆ ژیان (وَكَذَلِكَ أَوْحَيْنَا إِلَيْكَ رُوحاً مِّنْ أَمْرِنَا مَا كُنتَ تَدْرِي مَا الْكِتَابُ وَلَا الْإِيمَانُ وَلَكِن جَعَلْنَاهُ نُوراً نَّهْدِي بِهِ مَنْ نَّشَاء مِنْ عِبَادِنَا وَإِنَّكَ لَتَهْدِي إِلَى صِرَاطٍ مُّسْتَقِيمٍ) (الشورى: ٥٢) واتە: هەر بەوشێوەیە وەحیی پێ دێت، قورئانمان بۆ تۆ نارد ئەی موحەممەد بە فەرمانی خۆمان، کە تۆ نەتدەزانی کێتب و ئیمان چییە، بەڵام ئێمە ئەوەمان کردە ڕووناکییەك و ڕێنموونی هەر کەسێکی پێدەکەین بمانەوێ لە بەندەکانمان، بە ڕاستی تۆ ڕێنموونی دەکەیت بۆ ڕێگای ڕاست. مرۆڤ بانگ دەکات لە هەموو جێگەو کاتێکدا (لِيُنذِرَ مَن كَانَ حَيّاً وَيَحِقَّ الْقَوْلُ عَلَى الْكَافِرِينَ) (يس: ٧٠) واتە: بۆ ئەوە ئەم قورئانەمان بۆ ناردووە هەتا موحەممەد ئەو کەسانەی لە سزای قیامەت پێ بترسێنێ کە هۆشیارن و دڵیان زیندووە، بۆ ئەوەیش سزادان و سزای قیامەت دابمەزرێ و قەرار بگرێ لەسەر کافرەکان.

ئالیاتی بیر لێکردنەوە و خوێندنەوەی ڕاستین، پێویستە بۆ تێگەیشتنی قورئان پەنا ببەیتە بەر تەفسیرێکی باوەڕپێکراوی هاوچەرخ، یان نزیکردنەوەیەکی ڕاڤەیی "المقاربة التفسيرية" بە زمانی خۆجێیی و خۆماڵی، تا خوێنەر بگاتە ئاستێکی وەرگرتنی تایبەت لە قورئان، بەڵام داڵدە و پەنا نییە لە بڕیاردانی پڕ لە ڕاستیی قەدەری خوا کە ئەم پەرتووکەی ناردووەتە خوارەوە.

(وَمَا قَدَرُواْ اللّهَ حَقَّ قَدْرِهِ إِذْ قَالُواْ مَا أَنزَلَ اللّهُ عَلَى بَشَرٍ مِّن شَيْءٍ قُلْ مَنْ أَنزَلَ الْكِتَابَ الَّذِي جَاء بِهِ مُوسَى نُوراً وَهُدًى لِّلنَّاسِ تَجْعَلُونَهُ قَرَاطِيسَ تُبْدُونَهَا وَتُخْفُونَ كَثِيراً وَعُلِّمْتُم مَّا لَمْ تَعْلَمُواْ أَنتُمْ وَلاَ آبَاؤُكُمْ قُلِ اللّهُ ثُمَّ ذَرْهُمْ فِي خَوْضِهِمْ يَلْعَبُونَ) (الأنعام:

٩١)، واته: وەك پێویست خوایان نەناسی و ڕێزیان لێنەگرت، کاتێ وتیان خوا هیچ شتێکی نەناردووەتە خوار بۆ هیچ ئادەمییەك"..... ئەگەر وا نەبێت کاریگەری وەرگیری ڕوونادات. هەروەك لە بیرمان نەچێت، پێویستە وێناکردن و سەرگەرمی و خەیاڵ و گرنگیدانە دوورەکان لە نیگای قورئان و هێنانی ئایەتەکان لە کاتی بیرکردنەوەدا، بە پێداگرتن بێت لەسەر چەند کاتێکی تایبەتی کە دوور بێ لە وێنە و دەنگ و هەروەك لە شەودا هەیە کار بە ڕادیۆ، یان کەناڵە فەزاییەکان دەکات بەسەر قورئاندا و خۆی و هاوڕێکانی بە قسە و گفتوگۆی لابەلاوە سەرگەرم دەکات، خوای گەورەش دەفەرموێ (وَإِذَا قُرِئَ الْقُرْآنُ فَاسْتَمِعُواْ لَهُ وَأَنصِتُواْ لَعَلَّكُمْ تُرْحَمُونَ) (الأعراف: ٢٠٤) واته: هەر کاتێك قورئان خوێندرایەوە گوێی بۆ بگرن و بێدەنگ بن، هیوا وایە ڕەحمتان پێبکرێت. لای هەندێك ڕاکێشانی دڵ و هەست بەدی ناکەین لەگەڵ واتای ئایەتەکاندا، مەگەر بە دەگمەن، هەندێك دەڵێن سەقفی قورئان بەرزە و ئێمە نزمین....

کەسانی کەش دەڵێن بێگومان ترسی بەهێز وا دەکات لە مرۆڤ کە ناتوانێت لە بەدواداچووندا بەردەوام بێت، هەندێك لە خودا و قسەی خودا ڕا دەکات بۆ لای قسەی مرۆڤ، گومانی تێدا نییە لە هەموو کات و دۆخەکاندا بە ڕاستی قورئان "بەرز و زاڵە" بێگومان، بەڵام کاربەجێیە و بە کاربەجێی و وردە وردە کار دەکات. بەڵام ئێمە پێویستیمان بە تێگەشتنی وردی "فقه، باش خوێندن"ەوەی و "الترتیل" لە پێشترین شتێك و بە شێوەیەك قورئان بخوێنینەوە کە نزیکمان بکاتەوە لە خودا لە کاتە گونجاوەکاندا، بابەتی پارچە پارچە بوون لە قورئاندا هاتووە و ڕووداوەکانی لە کەلەپووردا ناوبراون، لەوێدا فەرموودەیەك لە پێغەمبەرەوە هاتووە لەو بارەوە زۆر لە تۆبەکەران گیانیان دەرچووە بە بیرهێنانەوە و هوشدارێك و زۆرێکیشی باوەڕی هێناوە بە خوێندنەوەیەکی کاریگەر، بەڵام لەگەڵ ئەمەشدا هاوسەنگی پێویست و داواکراوە. پێغەمبەران

لەوپەڕی نزیکیدا بوون لە خواوە، بەڵام هەر لە خوا دەپاڕانەوە بە ترس و ئومێد و هیواوە.

هـەروەها یـەکێك لـە مەرجـەکانی چـوونە نـاو جیهـانی قورئـان داوای پەنادانـە "الاستعاذة"، کە ئەمەش بە وتنـی چـەند وشـەیەك نییـە، بـەڵکو دوورخسـتنەوەی کاریگـەریی شـەیتانە لەسـەر دڵ بـە کـارێکی خۆویسـتانە، بـۆ ئـەوەی پێویسـتی بەزانینە دەربارەی ئەم هاتنە ناوەوەی شەیتان، سەرەڕای دابڕینی لـە پێکهێنـەرە هزری و دەروونییەکان، ئامارکردن و هەڵبژاردنی ئـەو ئایەتەنـەی نـاوی شـەیتان و چالاکی و ئالیەتی کاریگەری لە سەرمانی تێدایە، هەروەك کـارتێکرانی دەروونـی و دڵی لەگەڵ ئایەتدا ئەوەیە کە ترسمان تێدا بڕوێنێ و بمانگریەنێ و هیوا و ئاواتمان تێدا دروست بکات، یان لێپرسینەوەی خـود بـۆ تـەواوکردنی ناتەواوییـەکانی، یـان دەستکێشـانەوە لــە قەدەغـەکراوەکان، جێبــەجێکردنی داخــوازی و هەنــدێکجار پاڕانــەوە و داواکردنـی بەهەشـتەکەی خـوا، یـان گـرتن لـە سـزای، وەڵامدانـەوەی پرسیارەکانی قورئان و دۆستایەتیی باوەڕداران.

لە داخوازییەکانی بیرکردنەوە، سوورنەبوونە لەسەر چەندیەتی بە تەنها، لەبـەر ئەوەی قورئانخوێن هەندێکجار ئایەتێك بە بەس دەزانـێ، کۆمـەڵێك لـە ئایـەت یـان لاپەرەیەك بەپێی توانا و بۆ کران لە تێگەیشتن، کە ئەوەش کردەوەی هەنـدێك لـە هاوەڵان و شوێنکەوتووان بووە... بۆ ئەوەی بۆشـاییەکانی تەمـەنی بکاتـە بـواری بیرکردنەوە.

لە خواستەکانی بیرکردنەوە، تۆمارکردنی پرسیار و بـەهرە و تێبینییەکانـە لـە کاتی خوێندوەداو گەڕانە بە دوای وەڵامەکانیاندا، فێربوونی شتە بناغەییەکانـە لـە ڕاڤـــە و تەئویلـــدا، واز لـــە گومانانـــەکان نـــەهێنێ و بگـــەڕێ بـــەدوای بەرپەچدانەوەکانیاندا.. کە ئەمەش تایبەت نییـە بـەو پسـپۆڕ و زانایانـەوە، لەبـەر ئەوەی هەندێکیان شوێن ئایەتە "موتەشـابیهەکان" دەکـەون و تووشـی گومانیـان دەکـات بەرامبـەر ڕاسـتیەتیی قورئـان، یـان پـەنا دەبەنـە بـەر فەلسـەفە و هـزر و

وەڵامــی کۆتــایی نادەنــەوە لەســەر پرســیارانێکی زۆر، لەوانــە پرســیار لەســەر چــارەنووس و ئــەودیو ژیــان و بوونــەوەر. لــە خواســتەکانی پــەنا بردنــە بــەر دەستکەوتە زانیارییە هاوچەرخەکانە بۆ پتەوکردنی باوەڕی لـە مێـژوو و زانیارییـە گەردوونییــەکان و پزیشــکی و زانیــاریی ئەندامناســی، فیزیــا و کیمیــا و بابەتــە هزرییەکان لە زانیاریی دەروونزانی و کۆمەڵناسی و سیاسەت و مێـژوو و ئـەدەب و زانیارییە نوێکانی تر، وەردەگرێت.

(قَدْ خَلَتْ مِن قَبْلِكُمْ سُنَنٌ فَسِيرُواْ فِي الأَرْضِ فَانْظُرُواْ كَيْـفَ كَـانَ عَاقِبَـةُ الْمُكَـذَّبِينَ) (آل عمـران: ١٣٧)، واتــە: پــێش ئێــوە ڕووداوی زۆر هــاتووە بەســەر موسـڵمانان و بێباوەڕاندا، بڕۆن بگەڕێن بەسەر زەویـدا و تەماشـا بکـەن تـا بـزانن سـەرئەنجامی باوەڕنەکران بە حەق و ڕاستی، چۆنە.

(أَفَلَمْ يَسِيرُوا فِي الْأَرْضِ فَتَكُونَ لَهُمْ قُلُوبٌ يَعْقِلُونَ بِهَا أَوْ آذَانٌ يَسْمَعُونَ بِهَا فَإِنَّهَا لَـا تَعْمَى الْأَبْصَارُ وَلَكِن تَعْمَى الْقُلُوبُ الَّتِي فِي الصُّدُورِ) (الحـج: ٤٦)، واتــە: ئایـا هێشـتا ئەم کافرانەی قورەیش نەگەڕاون بەسەر زەویدا و دڵێکی وایان هـەبێت کـە فـاهمی ئەسراری پێ بکەن؟ (وَنَفْسٍ وَمَا سَوَّاهَا * فَأَلْهَمَهَا فُجُورَهَا وَتَقْوَاهَا) (الشـمس: ٧ــ ٨ )، واتە: سوێند بە نەفس و دروستکەری کە ڕێگەی چاك و خراپی پێنیشانداوە.

(فَاعْتَبِرُوا يَا أُولِي الْأَبْصَارِ) (الحشر: ٢)، واتە: ئـەی خـاوەن ژیـری و چـاوەکان لەم شتانە پەند وەربگرن.

(وَتِلْكَ الأَيَّامُ نُدَاوِلُهَا بَيْنَ النَّاسِ) (آل عمران: ١٤٠)، واتە: ئەمە چەند ڕۆژێکە ئـەم دەستو ئەو دەستی پێدەکەین لە نێوان خەڵکدا.

(وَجَعَلْنَا اللَّيْلَ وَالنَّهَارَ آيَتَيْنِ فَمَحَوْنَا آيَـةَ اللَّيْـلِ وَجَعَلْنَـا آيَـةَ النَّهَـارِ مُبْصِـرَةً لِتَبْتَغُـواْ فَضْلاً مِّن رَّبِّكُمْ وَلِتَعْلَمُواْ عَدَدَ السِّنِينَ وَالْحِسَابَ) (الإسراء: ١٢)، واتە: شەو و ڕۆژمـان کردووە بە دوو نیشانە لەسەر بوونی خۆمان، نیشـانەی شـەومان لابـرد، نیشـانەی ڕۆژمان ڕۆشن کردووە. (وَالسَّمَاء بَنَيْنَاهَا بِأَيْدٍ وَإِنَّا لَمُوسِعُونَ) (الذاريات: ٤٧)، واتە: ئاسمانمان بە هێز دروستکردووە و فراوانی دەکەین. (فَلَـا أُقْسِـمُ بِمَوَاقِـعِ النُّجُـومِ *

(وَإِنَّهُ لَقَسَمٌ لَّوْ تَعْلَمُونَ عَظِيمٌ) (الواقعة: ٧٥ ـ ٧٦)، واته: سوێند دەخۆم بە پێگەی ئەستێرەکان، کە بە ڕاستی ئەگەر بزانن سوێندێکی گەورەیە.

(يَخْلُقُكُمْ فِي بُطُونِ أُمَّهَاتِكُمْ خَلْقاً مِن بَعْدِ خَلْقٍ فِي ظُلُمَاتٍ ثَلَاثٍ ذَلِكُمُ اللَّهُ رَبُّكُمْ لَهُ الْمُلْكُ لَا إِلَهَ إِلَّا هُوَ فَأَنَّى تُصْرَفُونَ) (الزمر: ٦). سەرەتای سورەتی "الرحمن" لە ئایەتی "٩ ـ ٢٢" و زانیاری چینەکانی زەوی (وَمِنَ الْأَرْضِ مِثْلَهُنَّ) (الطلاق: ١٢)، واتە: لە زەویش وەك ئاسمانەکان حەوت چینی دروستکردووە.

(وَمِنَ الْجِبَالِ جُدَدٌ بِيضٌ وَحُمْرٌ مُّخْتَلِفٌ أَلْوَانُهَا وَغَرَابِيبُ سُودٌ) (فاطر: ٢٧)، واتە: لە شاخەکان ڕێگەی جۆراوجۆری دروستکردووە، لە سپی لە سوور ـ پێویستە ـ دەبێت ـ مرۆڤ ڕۆژ لە دوای ڕۆژ بالآنسی زیاد بکات لە بیرلێکردنەوەی قورئان، تاکو تووشی دابڕان و دوورکەتنەوە نەبێت لە قورئان و لە ڕووی باوەڕ و زانیاری و بانگخوازییەوە و دووچاری چەقبەستنی هزری و بیری نەبێت و گومان و دوودڵی و بێئاگایی و سەرسامیی بۆ دروست نەبێت لە بەرامبەر قورئاندا....

قورئان کات ڕاڤەی دەکات و بۆ هەموو سەردەمێك بەخششی خۆی هەیە، زیانی نییە کە دەستکەوتە تەکنۆلۆژییەکانی سەردەم لەگەڵ قورئاندا بەراورد بکرێت، هەروەها بەرهەمە فەلسەفی و پەروەردەیی و دەستکەوتەکانی مرۆڤ و دەرکەوتنی ئیعجازی قورئان. قورئان پەرتووکێکی پیرۆزە لەبەر ئەوەی قسەی خوایە، پایەی بەرزە لە "لوح المحفوظ" داهێنەرەکەی فریشتەیەکی بەخشندەیە کە ئەویش جبریلە... هەندێکجار فریشتە ئایەتەکان بەڕێدەکەن، پێغەمبەرێکی پیرۆز، دڵێکی پاك، لەبەری کردوون و وشەکانی پیرۆزە و واتاکانی فراوانە. پیرۆزە لەو پێوانەدا کە لێی دەدوێت لە بوونەوەر و ژیان و نادیار و دیار، فەرداریی ئەو لێکۆڵینەوانەی لە بارەیەوە ئەنجام دراون بە درێژایی مێژوو. پەیامەکەی پیرۆزە و بە فەرە بۆ زیندووان و نەتەوە و شارستانیەتەکان، پیرۆزە لە کاریگەری و کارتێکردن و شوێنەوارەکانیدا "عبدالفتاح الخالدي" دەڵێت "... بۆ نموونە دەربارەی هەرەسهێنانی حەتمیی شارستانیەتییەکان دەڵێ: (وَلِكُلِّ أُمَّةٍ أَجَلٌ فَإِذَا

جَاء أَجَلُهُمْ لاَ يَسْتَأْخِرُونَ سَاعَةً وَلاَ يَسْتَقْدِمُونَ) (الأعراف: ٣٤)، واته: ماوەی بوون بۆ هەرکەسێك و بۆ هەر کۆمەڵێك بڕاوەتەوە، کەمکردن و زیادکردنی.

لەبارەی تەنگەژەی مرۆڤی هاوچەرخەوە، کە پشتی لە یاد و بەرنامەی خوا کردووە و باسی بارودۆخی ژیانی دەرەوونی دەکات (وَمَنْ أَعْرَضَ عَن ذِكْرِي فَإِنَّ لَهُ مَعِيشَةً ضَنكاً وَنَحْشُرُهُ يَوْمَ الْقِيَامَةِ أَعْمَى) (طه: ١٢) واتە: هەرکەسێك لە بەرنامە و یادی من پشتی هەڵکرد، ئەوا بێگومان ژیانی تاڵ دەکەین و ڕۆژی دوایی بە کوێری حەشری دەکەین.

پەروەردە و پاککردنەوە لەگەڵ فێرکردن لە قورئاندا، شان بە شانن (كَمَا أَرْسَلْنَا فِيكُمْ رَسُولاً مِّنكُمْ يَتْلُو عَلَيْكُمْ آيَاتِنَا وَيُزَكِّيكُمْ وَيُعَلِّمُكُمُ الْكِتَابَ وَالْحِكْمَةَ وَيُعَلِّمُكُم مَّا لَمْ تَكُونُواْ تَعْلَمُونَ) (البقرة: ١٥١) واتە: هەروەك لە ناو ئێوەدا پێغەمبەرێکمان نارد کە ئایەتەکانی ئێمە دەخوێنێتەوە بە سەرتاندا و پاکتان دەکاتەوە و فێری قورئانتان دەکات، هەروەها حیکمەتیش، فێری شتانێکتان دەکات کە لە مەوبەر نەتاندەزانی.

کەسێك قورئان دەخوێنێتەوە و بیری لێدەکاتەوە، پێویستە پابەندی ڕەوشتەکانی بێت. خۆی بپارێزێ لە مێژوو و سەر لە خۆ سوڕمان و ڕووپامایی و ململانێی نابەجێ و ئیرەییبردن و تێکشکاندنی کەسەکان. ئاکاری قورئان خاوەنی دەستەڵاتی پابەندکردنە بە پێچەوانەی یاسای دەستهەڵبەستی مرۆڤەوە. ئەو زمانەی قورئان دەخوێنێتەوە پێویستە لەسەری واز لە گاڵتەکردن بهێنێ بە کەسانی تر و لە پاشملە باسکردن و بە سووك تەماشاکردنی مرۆڤەکانی تر. ئەو چاوەی تەماشای قورئان دەکات قەدەغەیە لە نواڕین بۆ ئەو شتانەی کە خودا نایەوێت لە تەماشاکردنی ڕەگەزی و....هتد، ئەو گوێیەی قورئان دەبیستێت شایەتە بۆی دەبێت گۆرانیی خراپ و ناشیرین نەبیستێت....

(محمد غزالي) دەربارەی بیرلێکردنەوەی قورئان دەڵێت: "ئەگەر موسڵمانان بە ڕاستی بیر لە قورئان بکەنەوە، ئەوا بەمشێوەیە دووچاری سەرشۆڕی و داڕمان و

ژێردەستەیی و نائومێدی و ستەمی کۆمەڵایەتی نەدەبوون. بەڵام کێشـە لەوەدایـە کە قورئان بە دابـڕاوی لـە ژیـانی موسـڵمانان ماوەتـەوە و ئاگـاداری ئـەم بابەتانـە نەبوون". [٧]

## چۆن مامەڵە بکەین لەگەڵ قورئاندا؟

خەریکە پەرتووکەکەمان لە کیس دەچێت. وەکو مۆسـیقایەك لەلایـەن هەنـدێك لـە قورئانخوێنـە بەناونگەکاتـەوە نیشـان دەدرێـت، لەگـەڵ خۆگێلکردنـدا گـوێی لێدەگرین، لەبەر ئەوەی ئێمە دەمانەوێ لە کۆڕی ئاخ و ئـۆف و سەرسـوڕماندا بـە یەك بگەین. بەڵام ئەوەی کە قورئان پەرتووکێکی بزوێنەر بێت بۆ شارستانییەکان، بە ڕاستی ئەمانە هەموو لێمان ئاوایە، لەبـەر ئـەوەی ئێمـە سـەرگەرمی شـتانی تـر بوون جگـە لـە قورئـان، ئەمـەش ئەوەیـە لای ئێمـە ڕەفـزە". [٨] لـە داخوازییـەکانی بیرلێکردنەوە لە قورئان، ئەوەیە باوەڕمان بە هەموو قورئـان بێـت و بـەش بەشـی نەکەین بەپێی ئارەزوو و بڕیاری تایبەتمان.

(كَمَا أَنزَلْنَـا عَلَـى الْمُقْتَسِـمِينَ * الَّـذِينَ جَعَلُـوا الْقُـرْآنَ عِضِـينَ * فَوَرَبِّـكَ لَنَسْـأَلَنَّهُمْ أَجْمَعِيْنَ * عَمَّا كَانُوا يَعْمَلُونَ) (الحجر:٩٠ ـ٩٣)، وەك چەند پەڕەیەکی نووسـراو یـان چەند ڕایەك تەماشای نەکەین، هەروەك کەسانی جگە لـە خۆمـان بـەو شـێوەیەیان کردووە.

(تَجْعَلُونَهُ قَرَاطِيسَ تُبْـدُونَهَا وَتُخْفُـونَ كَـثِيراً) (الأنعـام: ٩١)، واتـە: ئێسـتە ئێـوە دەیکەن بە چەند بەشێك و هەر بەشێکی بتانەوێ دەریبخـەن و زیـانی نـەبێت، بـۆ دڵخوازیی ئێوە دەینووسینەوە لەناو چەند پارچە کاغەزێدا..

---

[٧] ـ كيف نتعامل مع القران، محمد الغزالي، ص ١٨.

[٨] ـ هەمان سەرچاوە، ل٢٢٤.

(يَا أَهْلَ الْكِتَابِ قَدْ جَاءكُمْ رَسُولُنَا يُبَيِّنُ لَكُمْ كَثِيراً مِّمَّا كُنتُمْ تُخْفُونَ مِنَ الْكِتَابِ وَيَعْفُو عَن كَثِيرٍ قَدْ جَاءكُم مِّنَ اللّهِ نُورٌ وَكِتَابٌ مُّبِينٌ) (المائدة: ١٥)، لە ئایەتێکی تردا (أَفَتُؤْمِنُونَ بِبَعْضِ الْكِتَابِ وَتَكْفُرُونَ بِبَعْضٍ فَمَا جَزَاء مَن يَفْعَلُ ذَلِكَ مِنكُمْ إِلاَّ خِزْيٌ فِي الْحَيَاةِ الدُّنْيَا وَيَوْمَ الْقِيَامَةِ يُرَدُّونَ إِلَى أَشَدِّ الْعَذَابِ) (البقرة: ٨٥).

برای خوێنەر با واز بێنین لە کەمتەرخەمی یان لەکارخستن یان تەئویلی نادادگەرانە یان باوەڕ نەبوون بە هەندێك لە قورئان، چونکە ئەوە دەبێتە هۆی ناتەواوییەکی گەورە لە ژیاندا. پەیوەندییە گشتییەکان کە پشتگوێی دەخەین، شوێنەوارە خراپەکانی بە دەردەکەون و چارەسەری گران دەبێت... بێگومان ئارەزوو و داخوازییە دەروونی و فەلسەفە کورت دەهێنن و ئەو بیرکردنەوەی کە پێی دەوترێت ئەزموونە ڕۆحییەکان یان "یۆگا" یان زیندووکردنەوەی ئاینە لەناوچووەکان و پەرتووکە گۆڕاوەکان، یان ئەو ئەفسانانەی کە "لیفی شتراوس" زیندووی کردونەتەوە، ناتوانن ببنە جێگرەوەیەك لەبری ئیسلام، چونکە ئەمانە بە ڕاستی یەقینێکی "دڵنیاییەکی" زانستییانە نادەن بە دەستەوە. لەو گومانانەی دەربارەی قورئان وروژێنراون کە گوایە ناتەواویی گۆڕانی تێدایە، وەکو "جابری" لە تەفسیرەکەیدا بۆی چووە، هەندێکاتیش لە "جولدزیر"ی ڕۆژهەڵاتناسەوە هاتووە، یان لە چەند گێڕانەوەی مێژووەوە پێمان گەیشتووە کە ناگاتە پلەی "تەواتوری" بێگومان و حەقی یان گێڕانەوەی مرۆیی کە لەگەڵ قورئان و لۆجیکی ناوەکی قورئاندا نایەتەوە و ڕێکناکەوێ.

فەرموودەی خوا وەك بەڵگەیەك لەسەر لەبیرچوونەوەیەك کە گومانی لەسەر نییە (سَنُقْرِؤُكَ فَلَا تَنسَى) (الأعلى: ٦)، واتە: ئایەتەکان دەخوێنینەوە بەسەرتدا و تۆش لە بیرت ناچێتەوە. واتە ناهێڵین.

ڕوونی کردووەتەوە کە بێگومان پێغەمبەر لە بیری ناچێتەوە کە ئەویش بەسراوە بە ڕەهایی خواوە تا کارەکە لە چوارچێوەی ویستی ئەودا بێت، تا ئەم ویستە گەورە کە لە بەرچاوی هەموواندا بێت، ئاڕاستەی ئاگادارییەکە بەرەو ویستە

گەورەکە بڕوات"[٩] و دڵ هەمیشە ئاوێزانی ویستی خوا بێت، ئەم دەرکردنە بۆ ئاوێزان بوونە بە ویستەکەوە، پەنا بردنە بۆ پەروەردگار نەك بۆ چەسپاندنی ئەو لەبیرچوونەوەیە.. هێنانی ئایەتێك لەبری ئایەتێکی تر وەك لەم فەرمودەیەدا هاتووە (وَإِذَا بَدَّلْنَا آيَةً مَّكَانَ آيَةٍ وَاللّهُ أَعْلَمُ بِمَا يُنَزِّلُ قَالُواْ إِنَّمَا أَنتَ مُفْتَرٍ بَلْ أَكْثَرُهُمْ لاَ يَعْلَمُونَ) (النحل: ١٠١)، واتە: بێگومان ئەم لەبری هێنانە لەلایەن خوداوە بوو، نەك سەرەتا لە پێغەمبەرەوە، چونکە ئەگەر لە پێغەمبەرەوە بوایە ئەوا دەرچوون بوو لە دەق، کە دیارە قورئانیش بەرپەرچی ئەمەی داوەتەوە لەم ئایەتەدا کە دێت، پاشان ئەمیش ئایەتی یەکەمی لە جێگەی خۆی دەرنەهێناوە، بەڵکو ئایەتە لەبری هێنراوە کە "المبدلة" بۆ ڕووبەڕووبوونەوەی کارێکی تایبەتی بووە، پاشان واقیعەکە گۆڕاوە و ئایەتێکی تر هاتووەتە خوارەوە. "سەیدیش" نموونەیەك دێنێتەوە و دەڵێت: ئایەتی یەکەم وەك چارەسەر وایە و ئایەتی (وَمَا أَرْسَلْنَا مِن قَبْلِكَ مِن رَّسُولٍ وَلَا نَبِيٍّ إِلَّا إِذَا تَمَنَّى أَلْقَى الشَّيْطَانُ فِي أُمْنِيَّتِهِ فَيَنسَخُ اللَّهُ مَا يُلْقِي الشَّيْطَانُ ثُمَّ يُحْكِمُ اللَّهُ آيَاتِهِ وَاللَّهُ عَلِيمٌ حَكِيمٌ) (الحج: ٥٢) دەبێتە بەڵگە لە سەری، شەیتان دەچووە ناو خوێندنەوەی پێغەمبەرەوە" ئەگەر نەخوێندەواری خوێندنەوە بوایە و ئاواتخواستنی هزری نەبوایە".

خوای گەورە ئایەتەکانی بەهێز و جێگیر دەکات، بوار ناهێڵێتەوە بۆ ڕیشە داکوتانی چوونە ناوەوەی بابەتی دەنگی یان بۆشاییانە...

بەڵام ئایەتی سڕینەوە "النسخ" بۆ هەندێ لە ئایەتەکان، ئەوە نییە کە مانای سڕینەوە و نەهێڵانی ئایەت بێت، بەڵکو لە حیکمەتی ئایەتەکانە، لەبەر ئەوەی لە هەندێك کاردا واقیع دەگۆڕێت و ئایەتەکانیش بە دوایدا دێت، دەقیش لە کۆی خۆیدا جێگیرە و هیچی لێ لانابرێت .... ئەمە ڕای "سەید قوتب و بابە عەلی شێخ عومەری قەرەداغی و دکتۆر مستەفا زەڵمییە".

---

[٩] ـ في ظلال القران، سيد قطب، ج٦، ص٣٨٨٩.

فەرموودەی خوا: (وَلَقَدْ أَرْسَلْنَا رُسُلاً مِّن قَبْلِكَ وَجَعَلْنَا لَهُمْ أَزْوَاجاً وَذُرِّيَّةً وَمَا كَانَ لِرَسُولٍ أَن يَأْتِيَ بِآيَةٍ إِلاَّ بِإِذْنِ اللّهِ لِكُلِّ أَجَلٍ كِتَابٌ * يَمْحُو اللّهُ مَا يَشَاءُ وَيُثْبِتُ وَعِندَهُ أُمُّ الْكِتَابِ) (الرعد: ٣٨ـ ٣٩)، نەبەستنی باوەڕی قسەکەرانە لەگەڵ پێغەمبەر بە قورئانەوە، بەو ئایەتانەی قسە لە بەرهەستکەوتوو و (المادي) بینراوەکان دەکەن، پەیوەندیی بە قورئان و کیتابەوە نییە.

موحەممەد غەزالی دەڵێت: "کاتێك لە تەفسیری ئیبن کەسیردا فەرموودەیەکی سەنەد لاواز دەخوێنمەوە کە تێیدا دەڵێت: سورەتی (الاحزاب) ئەوەندەی سورەتی (البقرة) درێژ بووە، پاشان ئەوەی لێ نەسخ بووەوە کە لێی نەسخ بووەوە، ئایا دەگونجێ کە خودا سورەتێکی (٤٠) لاپەڕەیی دابەزێنێتە خوارەوە ئینجا (سی و پێنج) لاپەڕەی لێ بسڕێتەوە؟ چۆن ئەمە دەوترێت، کامەیە ئەو ڕێبازە بڕیاردەرە بەسەر ئەم جۆرە گێڕدراوە پڕ لە گومانانەدا؟

پێویستە بگەڕێمەوە بۆ ئەو پرەنسیپ و ڕێسا یەقینییانەی لە لامە، بەپێی ئەو قوتابخانەیەمان کە تێیدا پەروەردە بووین، ئێمە ڕێز لە (بە دەماودەم هاتوو (المتواتر) دەگرین و ڕێز لە فەرموودەی ناسراو (المشهور) دەنێین) بەڵام ئەگەر کتوپڕ فەرموودەیەکی (سەنەد لاواز) پێی بنێتە ناو (کایەوە) شەرعزان و فەرموودەناسەکان دەیان و سەدان وێنەی ئەم فەرموودەیەیان داوەتە دواوە بۆ ئەوەی ببێتە بڕیارێك بەسەر قورئانەوە، ئەمە شتێکی سەیرە و سەمەرەیە و پێویستە تەفسیرەکانی قورئان پاك بکرێنەوە لەم جۆرە فەرموودانە".[١٠]

لەبەرئەوە موحەممەد غەزالی دەڵێت: "بابەتی سڕینەوە و لابردن یان بڕیاردان بە (مۆمیایی) کردنی هەندێك لە ئایەتەکان، شتێکە و بوونی هەیە، بەڵام شیاو نییە پێی بوترێ کە کاری پێ ناکرێ و مرێنراوە.. ئەمە شتێکی راست نییە.. هەموو ئایەتێك دەگونجێت کاری پێ بکرێت، بەڵام خوای کاربەجێ خۆی ئەو هەلومەرجە

---

[١٠] کیف نتعامل مع القرآن، ص٤٢.

دەناسێ بۆ کارپێکردنی ئایەتەکە تێیدا، بەم هۆیەوە ئایەتەکانی قورئان بەسەر بارودۆخی ژیانی مرۆڤدا دابەش بوون بە کاربەجێی و ئامۆژگاریی باش و جوانەوە". (١١)

ئەم ئایەتە بەڵگەیە لەسەر نەبوونی گۆڕانکاری و دەسکاری و یاری پێ کردن یان لێ کەم کردن و گۆڕین لە قورئاندا: (إِنَّا نَحْنُ نَزَّلْنَا الذِّكْرَ وَإِنَّا لَهُ لَحَافِظُونَ) (الحجر: ٩)، واتە: ئێمە قورئانمان ناردووەتە خوارەوە و هەر ئێمە پارێزگاریی لێ دەکەین، پاراستنی خوای گەورە. قورئانی لە هەموو ئەمانەی وتمان پاراستووە، هەواڵی ئەویش راستە و پەیمانی گەورەترە لە بەجێنەهاتن، هەروەها فەرموودەی خوا: (إِنَّ الَّذِينَ كَفَرُوا بِالذِّكْرِ لَمَّا جَاءهُمْ وَإِنَّهُ لَكِتَابٌ عَزِيزٌ * لَا يَأْتِيهِ الْبَاطِلُ مِن بَيْنِ يَدَيْهِ وَلَا مِنْ خَلْفِهِ تَنزِيلٌ مِّنْ حَكِيمٍ حَمِيدٍ) (فصلت: ٤١ـ ٤٢)، واتە: ئەوانەی بێباوەڕ بوون بەم قورئانە کە ئەو بەڕاستی کتێبێکی زاڵە، نە لە باسی رابردوو درۆ دەکات نە لە باسی داهاتوو، لەلایەن خوای کاربەجێ و سوپاسکراوەوە هاتووە. لێ کەمکردنی قورئان، هەڵوەشاندنەوە یان لابردنی نابەرپرسارانەیە، هەروەها زیادکردنی شتێك لە قورئان، پووچە.

(قُلْ أَيُّ شَيْءٍ أَكْبَرُ شَهَادةً قُلِ اللّهِ شَهِيدٌ بِيْنِي وَبَيْنَكُمْ وَأُوحِيَ إِلَيَّ هَذَا الْقُرْآنُ لأُنذِرَكُم بِهِ وَمَن بَلَغَ أَئِنَّكُمْ لَتَشْهَدُونَ أَنَّ مَعَ اللّهِ آلِهَةً أُخْرَى قُل لاَّ أَشْهَدُ قُلْ إِنَّمَا هُوَ إِلَـهٌ وَاحِدٌ وَإِنَّنِي بَرِيءٌ مِّمَّا تُشْرِكُونَ) (الأنعام: ١٩)، واتە: ئەی پێغەمبەر ﷺ بەو کافرانە بڵێ کە باوەڕت پێ ناکەن، چ شایەتێك گەورەتر و زیاتر جێگەی بڕوایە بۆ سەلماندنی راستیی قسەکەم؟ هەر خۆیشت وەڵام بدەرەوە و بڵێ: گەورەترین شاهید لە بەینی من و ئێوەدا خودایە، کە ئاگای لە هەموو شتە، ئەم قورئانە بە وەحیی نێردراوە بۆ من تا ئێوە و هەرکەسێك خەبەری پێ بگا و پێی بترسێنم لە سزای رۆژی قیامەت، ئایا ئێوە ئەوەندە نەفامن شایەتی دەدەن لەگەڵ خودادا

---

[11] کیف نتعامل مع القرآن، ص٨٣.

چەند خودایەکی تر هەیە؟ بڵێ من شایەتیی وەها نادەم، پێیان بڵێ: خودا هەر یەك خودایە، من بەرییم و دوورم و قایل نیم بەو شتانەی کە ئێوە دەیانکەنە هاوبەشی خودا. هەروەها فەرموودەی خودا (عزيزٌ) واتە: دەستەکان ناتوانن بیگۆڕن... پاشان بێگومان دەستێوەردان متمانە ناهێڵێت... جا پێ زیادکردن بێت یان لێ کەمکردنەوە، هەروەك هیچ شتێك لە بوونەوەر و ژیاندا رووی نەداوە (نەبووە) خوازیاری ئەم دەستتێوەردانە بێت.. ئەگەر شتێك لەم بابەتە رووی بدایە، هاوەڵان (صحابة) دەورووژان و رەخنەیان لە کۆکردنەوەکەی ئەبوبەکر و پاشان کۆکردنەوەکەی عوسمان دەگرت، لەکاتێکدا ئەمان کە فیداکاری ئیسلام بوون، عەلی کوڕی ئەبی تالیب بێدەنگ نەدەبوو. ئەو کەسەی ئەم وتەیەی دەدرێتە پاڵ کە وتوویەتی: "بێگومان شەڕی لەگەڵدا کردوون لەسەر تەئویل و دابەزاندنی، ئیتر چۆن بێدەنگ دەبێت لەسەر لێ کەمکردنی... پاشان ئەم قورئانە بەڕاست دانەر و گەواهە بەسەر کتێبەکانی پێش خۆیەوە (وَأَنزَلْنَا إِلَيْكَ الْكِتَابَ بِالْحَقِّ مُصَدِّقاً لِّمَا بَيْنَ يَدَيْهِ مِنَ الْكِتَابِ وَمُهَيْمِناً عَلَيْهِ فَاحْكُم بَيْنَهُم بِمَا أَنزَلَ اللّهُ وَلاَ تَتَّبِعْ أَهْوَاءهُمْ عَمَّا جَاءكَ مِنَ الْحَقِّ لِكُلٍّ جَعَلْنَا مِنكُمْ شِرْعَةً وَمِنْهَاجاً وَلَوْ شَاء اللّهُ لَجَعَلَكُمْ أُمَّةً وَاحِدَةً وَلَـكِن لِّيَبْلُوَكُمْ فِي مَا آتَاكُم فَاسْتَبِقُوا الخَيْرَاتِ إِلَى الله مَرْجِعُكُمْ جَمِيعاً فَيُنَبِّئُكُم بِمَا كُنتُمْ فِيهِ تَخْتَلِفُونَ) (المائدة: ٤٨)، واتە: ئێمە بەڕاستی قورئانمان نازڵ کردووە بۆت کە باوەڕی بە کتێبە پێشووە خوداییەکان هەیە و لە ئوسووڵ و بناغەی ئاینیدا پشتیگرییان لێ دەکات و دەیان پارێزێت لە گۆڕان و ئاگای لێیانە. تۆ ئەی پێغەمبەر، بەپێی فەرمانی ئەو قورئانەی خودا ناردوویەتی لەناو خەڵکدا، حوکم بکە و مەکەوە داوی ئارەزووی کافران و مونافیقان، کە لە رێی حەق و قورئان لات بدەن، هاتووە ئێمە بۆ هەر کۆمەڵێکتان رێبازێکمان داناوە لەسەری برۆن و لێی لا نەدەن. خوا بیویستایە دەیکردنە یەك ئوممەت، بەڵام بۆ ئەوەی تاقیتان بکاتەوە ئاخۆ باوەڕ بە شەریعەتە جیاجیاکان دەهێنن، کاری خێر و چاکە بۆ دواییتان، ئێوە بۆ لای خوا دەگەڕێنەوە و بۆتان رووندەکاتەوە کامتان لەسەر حەق بووە و

کامتان لەسەر ناحەق، ئیتر چۆن راستگۆ و باوەڕپێکراو دەبێت لەکاتێکدا بێ چوارچێوە و ناتەواو بێت.. ئینجا چەند هاوەڵێك (صحابة)ی خۆی هەبوون هەموو قورئانیان لەبەر بووە، ئەوەتا لە جەنگی یەمامەدا (٧٠) کەسیان لێ شەهید بوو (بَلْ هُوَ آيَاتٌ بَيِّنَاتٌ فِي صُدُورِ الَّذِينَ أُوتُوا الْعِلْمَ وَمَا يَجْحَدُ بِآيَاتِنَا إِلَّا الظَّالِمُونَ) (العنكبوت: ٤٩)، واتە: قورئان چەند رابەر و نیشانەیەکی ئاشکرایە لە دڵ و دەروونی کەسانێك کە زانینیان پێدراوە لەلایەن خواوە، هیچ کەس بێ بڕوا نییە بە ئایەتەکانی ئێمە، جگە لە ستەمکاران.

هەروەك لە بوخاری و موسلیمدا هاتووە کە (٧٠) کەسی تر لە هاوەڵان شەهید بوون، کە بۆ فێرکردنی قورئان ڕەوانەی شوێنانی جیاجیا کرابوون. ئینجا بابەتی حەوت جۆر خوێندنەوەکان (القرائات السبع) چەند فەرموودەی لەبارەوە هاتووە، لە خودی قورئاندا باس نەکراون... هەندێ لە یارانی پێغەمبەر وەك (عەبدوڵڵای کوڕی مەسعوود)، ڕای وایە کە ئەمانە دابەشکردنی بابەتی قورئانن، (تووڕەبوون، داخوازی، ڕەوایی، یاساغ، واتائاشکرا، (متشابە) بە واتای ناڕوونەکان، یان نەزانراوەکان، پەندەکان).

هەندێکی تر پێیان وایە تەنها کردارێکی قۆناغی جگەییە بۆ کردنەوەی گرێی زمانەوانی کە خۆی لە جیاوازیی دیالێکتەکانی زمانی عەرەبیدا دەنوێنێ. دابەزینی قورئان بە لەهجەی قوڕەیش ڕێگەیان پێدەدات بەشێوەیەکی کاتی بە نزیککردنەوەی زمانەوانی و رستەسازی و وشەسازی و ڕێسایی و تەجویدی (باش خوێندنەوە) پاشان کۆکردنەوەی خەلیفە عوسمان (ڕەزای خوای لێ بێت) هەموو ئەم جگانەی رابردووی بڕییەوە، هەروەك زانا و نووسەر (مناع القطان) دەڵێت: ئەوەی کە فەرموودەی شوێنکەوتووان و پێشینانی خواناس دەیسەلمێنێ (ئەوەیە بێگومان خوێندنەوەی قورئان بەو (حەوت پیتە) بۆ نەهێڵانی ناڕەحەتی و عەزیەت بووە لە سەرەتای کاردا، ئێستە ئەو پێویستییە نەماوە و بابەتی جیاوازی لە خوێندنەوەدا کۆتایی پێ هێنرا بە کۆکردنەوەی خەڵك لەسەر یەك شێوە

خوێندنەوە، هاوەڵانیش ئەم کارەی خەلیفە عوسمانیان پێ باش بوو، بۆیە بە کۆی دەنگ پەسەند کرا. ئەم کارەی خەلیفە عوسمان سەرکەوتنی بەدەستهێنا، چەند رایی لە خوێندنەوەی قورئاندا نەهێشت و یەکدەنگیی دروست کرد و نەتەوەی ئیسلامی خستە ئاسوودەییەوە)[١٢].

## ڕای موحەممەد غەزالی دەربارەی بیرکردنەوە لە قورئان

پێش ئەوەی ئەم وتارە کۆتایی پێ بێنین، ڕای مامۆستا موحەممەد غەزالی دێنین لەبارەی بیرکردنەوە لە قورئان لەگەڵ لەناوبردنی ئالیەت و شوێنەوارەکانی بیرکردنەوە، قسەکەمان بە هێنانی چەند رستەیەکی جوان لە (موحەممەد ئیقباڵ)ەوە دەست پێ دەکەین... لە چیرۆکی موحەممەد ئیقباڵ، شاعیری ئیسلام بۆ خوێندنەوەی قورئان پەند و ئامۆژگاری هەیە لە دابەزاندنی قورئاندا بۆ سەر دڵ، کە دەڵێت: (من هەموو رۆژێك عادەتم وابوو پاش نوێژی بەیانی قورئانم دەخوێند، باوکم دەیبینیم و پرسیاری لێ دەکردم، چی بکەم؟ منیش وەڵامم دەدایەوە و دەمووت: قورئان بخوێنە. بەردەوام بەو شێوەیە تا سێ ساڵ ئەو هەمان پرسیاری دەکرد و منیش هەمان وەڵامم دەدایەوە، رۆژێکیان وتم: باوکە چیتە؟ تۆ هەمان پرسیار دەکەی و منیش هەمان وەڵامت دەدەمەوە و ئەمەش وات لێناکات کە پرسیارەکان بگۆڕی. باوکم وتی: کوڕم دەمەوێت پێت بڵێم قورئان وا بخوێنەرەوە کە وەکو تەنها هاتبێتە خوارەوە بۆ تۆ. منیش لەو رۆژەوە هەوڵی تێگەیشتنی قورئان دەدەم و رووی تێ دەکەم، لە رووناکییەکانی وەردەگرم و لە دوڕ و مروارییەکانی هۆنراو و ڕستە دەگرمەوە)[١٣].

---

[١٢] مباحث في علوم القرآن، د. مناع القطان، مؤسسة الرسالة ، ط٣٥، ١٩٩٨، بيروت، ص١٤٨.

[١٣] الإيمان والتأثر بالقرآن الكريم، أحمد حسين ص١٤٣، وەرگیراوە لە: روائع الاقبال، ص٤٩.

بێگومان موحەممەد غەزالی لەبارەی وردبوونەوە و بیر لێ کردنەوەی قورئانەوە وتوویەتی: (ئەگەر لە ئایەتەکان وردبینەوە و بیریان لێ بکەینـەوە، لای کەمەکـەی دەیانبەینە گۆڕەپانی کردار و بەکارهێنانەوە، بۆ ئەوەی بـزانین چـۆن ئـەم ئایەتـە بەکاردەبـەین بـۆ چارەسـەر و رووبەڕووبوونـەوەی کێشـەکان).[١٤] ئـەم ئایەتـە دەکرێتە بەڵگە: (إِنَّ اللّهَ لاَ يُصْلِحُ عَمَلَ الْمُفْسِدِينَ) (يونس: ٨١).

ئێمە پێویستە ئەم ئایەتە بهێنین و تەماشـای کردەوەکانمـانی پـێ بکـەین، لـە کاتێکا کـە ناتـەواوە، ئایـا خـودا بۆمـانی تـەواو دەکـات؟ نـەخێر هـەرگیز تـەواوی ناکات، لەبەرئەوەی کردەوەی خراپ چاك ناکات..

پێویستە دەروونمان بگۆڕین هـەروەك ئایەتـەکان دەفـەرموون، لـە پـەرتووکی (جَدِّد حياتك)ەی (دیل کارینگی)دا هاتووە کە پیاوێك وتی بە کوڕەکەی لە کاتێکـا بۆ سەفەر چوو بۆ چارەسەر: بێگومان نەخۆشییەکەت لە دەروونی خۆتەوەیـە کـە لـە نێـوان پەراسـووەکانتایە، ئەگـەر ئـاڵوگۆڕی زەویـت کـرد، واتـە: گەشـتت کـرد لێرەوە چووی بۆ ئەوێ، بەڵام دەروونت لە رەشبینی و تاریکی و لادەریدا مایەوە، ئەوا هەرگیز گەشت و گەڕان سوودت پـێ ناگەیـەنێت... گۆڕانکارییـەکی دەروونـی پێویستە تا مانا بدات بەم گەشت و گەڕانە).[١٥]

غـەزالی روونـی دەکاتـەوە کـە بەرنامـەکانی فێرکـردن و هەنـدێك لـە دامـەزراوە پارێزگارییـەکان کـە سـووورە لەسـەر فێرکردنـی فـۆرمی و ڕواڵـەتی، پـڕن لـە کەموکوڕی.. هۆکاری دواکەوتنمان وازهێنانە لە زۆرێك لـە ئایەتـەکان و پێداگرتنـە تەنها لەسـەر ئایەتـەکانی ئـەحکام (بڕیارەکـان) کـە ژمارەیـان (٣٠٠ـ ٥٠٠) ئایـەت دەبن. هەندێك لە فـەرمانڕەوایان لـە سـەردەمە جیاجیاکانـدا وازیـان لـەو ئایەتانـە هێناوە کە دژی بوونیان ناوەستێ و بارودۆخیان ناخاتە بـەر هێـرش، ئەوانـەی کـە

---

١٤ كيف نتعامل مع القرآن، محمد الغزالي، ص٥٤.

١٥ كيف نتعامل مع القرآن، محمد الغزالي، ص٥٤.

ناویـــان بـــە شـــەرعزانی بـــراوە، ســـەرگەرمی بابـــەتی مامەڵـــەکان و رواڵـــەتی خواپەرستییەکانن. نموونەیـەك لەسـەر ئەمـە، پێـداگرییان کـردووە لەسـەر چـەند بابەتێکی تایبەت نەك گوێدانە بابەتەکانی جێنشینی زەوی، وەکو دەڵێن کە دەریـا ئاوەکەی پاککەرە و پاکە و مردووی ناوی حەڵاڵە، نەك باسکردنی ئەو رێگانەی کە قسە لە چۆنیەتی زاڵبوون دەکات لـە دەریاکانـدا لەبـەر بەرژەوەنـدی بزووتنـەوەی باوەڕ.. تا ئاماژە دەکات بۆ پێویستی زانیارییە گەردوونییەکان، دەڵێت: نەتەوەی قورئان گـورزێکی کوشـندەی لێـدرا کاتێـك شـەرعزانەکان بـە تـەنها هەوڵیانـدا کـە خۆیان بسەپێنن بەهۆی فیقهی لقەکانەوە (فیقهی عیبـادات) و لـق و پۆپـەکانیـەوە بەسەر هەموو کلتوور و رۆشنبیریی ئیسلامیدا، لە ئەنجامدا زانستە مرۆڤایەتییەکان تووشی چوونەوەیەکێکی توند هاتن، هەروەها زانستە گەردوونییەکانیش بە هەمان شێوە و زۆرێك لە جۆرەکانی مەعریفە تووشی هەمان کێشە هات).(١٦)

لەبارەی پەیوەندیی نێوان دەوڵەت و قورئانەوە، دەڵێت: "بێگومـان پـەلامار و هەژموونی بڕیاری تاکی لە پشت پووکانەوە و داکشانی توێژینەوە قورئانییەکانەوە هەبووە، بـەڵکو لـە پشـت پووکانـەوەی خـودی (فقـە)وە بـووە... فیقهـی یاسـایی ئـەوەبوو وای لـە ئەوروپاییـەکان کـرد کـە بگـەڕێن بـەدوای هێـز و دەسـەڵاتێکی دادوەری و یاسـادانان و جێبەجێکردنـدا، یـان ئـەوەبوو وای لێکـردن بکۆڵنـەوە لـە پەیمانی کۆمەڵایەتی لە نێوان بڕیـاردەر و بڕیـار بەسـەردا دراودا، ئـەم قسـەیە لای ئێمە بەبێ گیان و مردوو دەدرێتە قەڵـەم پـاش جێنشـینی راشـیدین، لەبەرئـەوەی هەڵمەت و فشاری فەرمانڕەوایی زمانەکانی بێدەنگ کردبوو)(١٧).

لـەبارەی تێگەشـتنی بـەرترەکان (فقـە الأولویـات)ەوە دەڵـێن: (بەڕاسـتی نەتەوەی ئیسلامی جێـی سەرسـوڕمانە کـە قورئـانی لەبـەر سـوننەت (فـەرموودە)

---

١٦ كيف نتعامل مع القرآن، محمد الغزالي، ص٨٨.

١٧ هەمان سەرچاوەی پێشوو، ل٩٠.

خستووەتە لاوە، ئینجا وازی لە سوننەت هێناوە بۆ قسەی زانایان، پاشان وازی لەوانیش هێناوە تەقریبەن، بۆ دانەری مەتنەکان)[18].

لەبارەی سەرنجدان و بیر لێ کردنەوەی قورئان، پاش تێپەڕاندنی پڕ بە پڕی (الدلالة) راستێتی (الواقعیة) وشەیەك یان رستەیەك، بۆ مەبەستی خوای گەورە لەو وشەیان رستەیە، (غەزالی) دەڵێت: لەو مانا وردە جوانانەی من دەیڵێم و لە کاتێکدا کە سورەتی (الاسراء)م لەبەرە و فەرموودەی خوا دەهێنمەوە: (وَكُلَّ إِنسَانٍ أَلْزَمْنَاهُ طَآئِرَهُ فِي عُنُقِهِ وَنُخْرِجُ لَهُ يَوْمَ الْقِيَامَةِ كِتَاباً يَلْقَاهُ مَنشُوراً) (الإسراء: ١٣)، واتە: ئیتر هەموو مرۆڤێك کردەوەکانیان ئاوێزانی ملی کرد و لە رۆژی قیامەتدا نامەیەکی بۆ دەردێنین، ئەویش بە والآیی چاوی پێی دەکەوێت. من وا تێدەگەیشتم کە لەوێ شتێك هەیە وەك کۆتر یان قالاو کە دەکرێتە مل)[19]. لە نیشانەکانی بیرکردنەوەی بابەتی و زانیارییانە کە بزانین و بێگومان ویستی خوا لەگەڵ هەوڵ و تێکۆشانی مرۆڤدایە، بزووتنەوەی دروستکراوانێکی زۆر بەلایەوە گرنگە ئەگەر چاك بوو (باش بوو) ئەگینای نەرێنی و پاڵ دانەوە و دانیشتن لە پێشکەوتنی شارستانی و بەرهەمدانەدا، کاتێ دەخوێنینەوە (تُؤْتِي الْمُلْكَ مَن تَشَاءُ..) (آل عمران: ٢٦)، واتە: دەسەلآت دەدات بە هەرکەسێك کە بیەوێت.

پێویستە لەسەرمان کە بزانین ئەوە بە هەوڵی مرۆڤ بەدی دێت، هەروەها گیرابوونی نزا:

(وَإِذَا سَأَلَكَ عِبَادِي عَنِّي فَإِنِّي قَرِيبٌ أُجِيبُ دَعْوَةَ الدَّاعِ إِذَا دَعَانِ فَلْيَسْتَجِيبُواْ لِي وَلْيُؤْمِنُواْ بِي لَعَلَّهُمْ يَرْشُدُونَ) (البقرة: ١٨٦)، واتە: ئەی موحەممەد هەرکاتێك بەندەکانی من پرسییان لە تۆ لەبارەی منەوە، پێیان بڵێ کە بێگومان من نزیکم لەوانەوە، پاڕانەوە و نزای ئەوان گیرا دەکەم، با ئەوانیش وەڵامی داواکاری و

---

[18] هەمان سەرچاوەی پێشوو، ل٩٠.

[19] كيف نتعامل مع القرآن، ص١٦٤.

فەرمانەکانی من بدەنــەوە، باوەڕیشـیان بـە مـن هــەبێت کـە هیـوا وایـە ڕێنمـوونی بکـرێن. لەبەرئـەوە (جـودت سـعید) جیـاوازیی لـەنێوان دوو خوێدنـەوەدا کـردووە (خوێندنەوەیەك لەگـەڵ سـەرنج و بیرکردنـەوە و خوێندنەوەیـەکیش کـە سـەرنج و بیرکردنەوەی لەگەڵدا نەبێت).[٢٠]

## ئالیەت و کاریگەریی خوێندنەوەی ڕاستەقینەیی قورئان

١ـــ بـــەهۆی کاریگـــەریی بیســـتنی ئایەتـــەکان، ئەندامـــەکانی بکەونـــە ژێـــر کارتێکردنەوە و بەهۆی هۆشدار و هەڕەشەی ناو ئایەتەکانـەوە، پاشـان شـتێك لـە دڵنیـایی ڕووی تــێ بکـات و مووەکـانی لەشــی ڕاسـت ببنــەوە، ئینجـا ئومێـد و ڕەحمەتی خوا لە دڵیاندا بلێسە بسێنێ (اللَّـهُ نَـزَّلَ أَحْسَـنَ الْحَـدِيثِ كِتَابـاً مُّتَشَـابِهاً مَّثَانِيَ تَقْشَعِرُّ مِنْهُ جُلُودُ الَّذِينَ يَخْشَوْنَ رَبَّهُمْ ثُمَّ تَلِينُ جُلُودُهُمْ وَقُلُوبُهُمْ إِلَى ذِكْرِ اللَّهِ ذَلِـكَ هُدَى اللَّهِ يَهْدِي بِهِ مَنْ يَشَاءُ وَمَن يُضْلِلْ اللَّهُ فَمَا لَهُ مِنْ هَادٍ) (الزمـر: ٢٣)، واتـە: خـوا ناردوویەتییە خوار بۆ سەر پێغەمبەر (دروودی خوای لەسەر بێـت) جـوانترین وتـار کە بریتییە لە کتێبێك کە ئایەتەکانی لە موعجیزە و هاوسەنگیی داڕشتن و ڕاستیی مانـا و گەیانـدنی سـوودی ئـادەمیزاددا لەیـەك دەچـن، لـە خوێندنـەوەدا دووبـارە دەکرێنەوە، ئەوەندە بەسامە پێستی ئـەو کەسـانەی لـە خـوای خۆیـان دەترسـن، موچڕکەی پێدا دێت و گرژ دەبێـت لـە ترسـی ئـەو هەڕەشـانەی تێیدایـە و پاشـان پێستیان نەرم دەبێتەوە و دڵیان بە هـۆی یادکردنـەوەی خـواوە ئـارام دەبێتـەوە، ئـەم حاڵەتـە هیدایـەتی خوایـە و هەرکەسـێك ویسـتی هـەبێت ڕێنمـوونی دەکـات، هەرکەسێکیش خوا گومڕای بکات کەس ناتوانێت ڕێگەی نیشان بدات. بێگومان بـە هۆی کۆمەڵێك لێکۆڵینەوەی فیسیۆلۆژییەوە دەرکەوتووە کە دڵ هەنـدێك دەمـاری تێدایە کە ئاماژەی (کارۆموگناتیسی) ڕەوانەی دەماغ دەکەن، دەرکەوتووە کە دڵ

---

[٢٠] كن كالن آدم، جودت سعيد، ل١١٥ـ ١٢١.

ترومپایەکی گەورەیەو پاڵ بە خوێنەوە دەنێت، کە هەرکەس نەشتەرگەریی چاندنی دڵی بۆ کراوە هەندێك لە رووخساری کەسایەتییان گۆڕاوە... هەندێك زانا وا لە دڵ دەڕوانن کە مەڵبەندی بیر و هزرە لە دەماغدا.

٢ـ لە شوێنەوارەکانی (کاریگەرییەکانی) خوێندنەوەی راستەقینە، خشوعی ناو دڵە: واتە: ئاوابوونی دڵ (أَلَمْ يَأْنِ لِلَّذِينَ آمَنُوا أَن تَخْشَعَ قُلُوبُهُمْ لِذِكْرِ اللَّهِ) (الحديد: ١٦)، واتە: کاتی ئەوە نەهاتووە بۆ ئیمانداران کە دڵیان بکەوێتە خشوع بە یادی خوا.

٣ـ گریان: (إِذَا تُتْلَى عَلَيْهِمْ آيَاتُ الرَّحْمَن خَرُّوا سُجَّداً وَبُكِيّاً) (مريم: ٥٨)، واتە: هەر کاتێك ئایەتەکانی ئێمە دەخوێنرێتەوە بەسەریاندا، دەچنە سوجدەوە و دەگرین.

لە عەبدوڕەحمانی کوڕی ئەبو لەیلاوە فەرموویەتی: ئەم ئایەتە سوجدەی تێدا بوو بردمان، ئەی کوانێ گریان؟ (وَيَقُولُونَ سُبْحَانَ رَبِّنَا إِن كَانَ وَعْدُ رَبِّنَا لَمَفْعُولاً * وَيَخِرُّونَ لِلأَذْقَانِ يَبْكُونَ وَيَزِيدُهُمْ خُشُوعاً) (الإسراء: ١٠٨ـ ١٠٩)، واتە: دەڵێن بێ عەیبی بۆ خودای ئێمە، بە راستی پەیمانی پەروەردگارمان جێبەجێ بووە و بۆ سوپاسی خوایە چەناگە و دەمەوڕوو دەکەون و کڕنووش دەبەن لە ترسی خودا، بە کوڵ دەگرین و تا بێت ئەو قورئانە ملکەچیان دەکات.

باوەڕمان هەیە بە بەدی هاتنی پەیمانی خوا لە دوارۆژدا و ئەو مەشهەد و شێوەی سزادانە کە بۆ مرۆڤ وێنا ناکرێت.. هەیە لەگەڵ ئایەتەکانی ترساندندا کارلێك دەکات، تاڕادەیەك لە هۆشی خۆی دەچێت و جاری واش هەیە دەگاتە لێواری مەرگ، کە ئەمەش ئامانج نییە.

٤ـ وەرگرتنی کۆمەڵێك شتی تازە لە هەموو جارێکدا و هەموو خوێندنەوەیەکدا، با کەمیش بێت، کە دەبێتە هۆی گۆڕینی هزر و هەست و ژیان و پەیوەندییەکانی (إِنَّمَا الْمُؤْمِنُونَ الَّذِينَ إِذَا ذُكِرَ اللّهُ وَجِلَتْ قُلُوبُهُمْ وَإِذَا تُلِيَتْ عَلَيْهِمْ آيَاتُهُ زَادَتْهُمْ إِيمَاناً وَعَلَى رَبِّهِمْ يَتَوَكَّلُونَ) (الأنفال: ٢)، واتە: هەر کاتێك ئایەتەکانی ئێمە خوێندرایەوە

بەسەریاندا، باوەڕیان زیاد دەبێت و کە ناوی ئێمەش دەبرێت، دڵیـان دەترسـێت و پشت بە خوای خۆیان دەبەستن.

(وَالَّذِينَ إِذَا ذُكِّرُوا بِآيَاتِ رَبِّهِمْ لَمْ يَخِرُّوا عَلَيْهَا صُمّاً وَعُمْيَاناً) (الفرقـان: ٧٣)، واتـە: ئەوانەیش کە ئەگـەر ئایـەتی خـوا بهێنرێتـەوە یادیـان، بـە کـەڕ و کـوێری ناکـەون بەسەریدا، وەك هیچ نەبینن و گوێیان لە هیچ نەبێت.

جۆرێك لە ژیانی تایبەتی هەیە کە تەنها کەسانێك تێی دەگەن کە باوەڕیـان بـە ڕۆژی دوایی و نیگا هەیە (يَا أَيُّهَا الَّذِينَ آمَنُواْ اسْـتَجِيبُواْ لِلّـهِ وَلِلرَّسُـولِ إِذَا دَعَـاكُم لِمَـا يُحْيِيكُمْ وَاعْلَمُواْ أَنَّ اللّهَ يَحُولُ بَيْنَ الْمَرْءِ وَقَلْبِهِ وَأَنَّهُ إِلَيْهِ تُحْشَرُونَ) (الأنفال: ٢٤)، ئەم ئایەتە لە پێشدا مانا کراوە.

٥ــ لــە کاریگەرییــەکانی خوێندنــەوە و ســەرنجدان، گومڕانــەبوون و لــەکیس نەچوونی هزرییە لە نێوان بیر و ئاینزای جۆربەجۆردا، بە بەرزکردنـەوەی دروشمـی نوێگەری و سیکۆلارییەوە تا کۆتایی تەمەنی نزیك دەکەوێتەوە، هیچ شتێك فریـای ناکەوێت. هەروەها بەدبەخت نەبوون لە ژیاندا و پیاکێشانی بەردەوام لەگەڵ ئەوی تردا بۆ پێچەوانەکردنەوەی راستی لەبەر (من، منی) و چاوچنۆکی (فَمَنِ اتَّبَعَ هُـدَايَ فَلَا يَضِلُّ وَلَا يَشْـقَى) (طـه: ١٢٣)، واتـە: کەسـێك بکەوێتـە شـوێن بەرنامەکـەی مـن گومڕا و بەدبەخت نابێت.

٦ـ هەروەها قورئان ڕووناکییەکی بەرهەستکەوتوو نییـە، بـەڵام بەسـەر شـوێنە تاریکەکانی هـزر یـان ئـەو شـتانەی بـە تاریکییـەکان ناویـان دەبـات، یـان کەلێنـە پەنهانەکان کە زانین و مەعریفەیەك نییە ڕووناکیان بکاتـەوە دەڕوانێـت (يَهْـدِي بِـهِ اللّهُ مَنِ اتَّبَعَ رِضْوَانَهُ سُبُلَ السَّلاَمِ وَيُخْرِجُهُم مِّنِ الظُّلُمَاتِ إِلَى النُّورِ بِإِذْنِـهِ وَيَهْـدِيهِمْ إِلَـى صِرَاطٍ مُّسْتَقِيمٍ) (المائدة: ١٦)، ئایا هەست دەکـەین بـە ڕۆشـتنی ڕوونـاکی بەسـەر ئەم بۆشاییانەدا، یان کارەکە بـە چـۆنێتییەکی نـەزانراو جێبـەجێ دەبێـت؟ زۆرتـر دووهەمیانە، بەڵام قورئان وەڵامی پرسیار دەداتەوە، کێشەکان چارەسـەر دەکـات و پێویستییەکان پڕ دەکاتەوە و تاریکییەکان ناهێڵێت.

ئەوەی شایانی باسە ئەوەیە کە قورئان چەندان ناو و سیفەتی هەیە، لەوانە: (مبارك) پیرۆز، (عزیز) زاڵ، (فرقان) جوداکەرەوە، (ذکر) یاد و باس، (برهان) بەڵگە ئاشکرا، (هدی) ڕێنموونی، (شفاء) چاکبوونەوە، (رحمة) میهرەبانی، (موعظة) ئامۆژگاری، (مبین) ئاشکرا، (بشری) مژدە، (مجید) خاوەن شکۆ، (بشیر) موژدەدەر، (نذیر) ترسێنەر... بۆ هەر ناوێك مانایەك هەیە کە پەیوەندیی بە کاریگەریی قورئانەوە هەیە لە مرۆڤدا و پەیوەندیی مرۆڤ بە ژیانی دنیا و دوارۆژیەوە، پێویستە لەسەرمان سوودی لێ وەربگرین...

**سوپاس بۆ خوای پەروەردگاری جیهانەکان.**

# زانستەکانی قورئانی پیرۆز و مێژوویيەتی دەق

## ئایا قورئان زادەی مێژووە؟!!
## وەڵامدانەوەی تۆمەتە هەڵبەستراوەکان

ئامادەکردنی:

موحەممەد موحەممەد حەمە میرزا

# پێشەکی

سوپاس و ستایش بۆ خـوای گـەورە، درووود لەسـەر گیـانی پـاکی پێشـەنگ و پێشەوامان موحەممەد پێغەمبەر (ﷺ)، لەسەر خانەوادە و شوێنکەوتووانی هـەتا ڕۆژی دوایی.

پاشان: ئەمڕۆ لە کتێبخانـەی کوردیـدا دەبیـنین بـە نـاوی زانسـتەوە ڕەواج بـە بۆچـوونی کەسـانێك دەدرێ، کـە لـە وڵاتـی خۆیـان بێبـازاڕ بـوون و باریـان پێچاوەتەوە. مەخابن کە لێرەیش کەسانێك هەن لە نەشارەزایی و لە خوێندنەوەی سـەرپێییەوە، بـە چـەندین نـاوی بریقـەدارەوە بـازاڕی خۆیـان گـەرم دەکـەن. هەرجارەی لە بـەرگێك یـان بـە ناوێکـەوە خۆیـان دەخەنـەڕوو، وا لـەم بابەتـە زۆر کورتـەدا دەبیـنین بـالۆرەی بـەناو مێژوویـەتی قورئانیـان کردووەتـە ویـردی سەرزمانیان، لای ئەوان بـەو مانایـە دێـت کـە (قورئـان بخرێتـە ژێـر ڕووداوەکـان و هزرە زمکانییە ڕێژەییە یـەك لـەدوای یەکـەکان، واتـە بەشـێوەیەکی ڕەهـا قورئـان بخرێتە ژێر کاریگەریی شوێن و کات و مێـژووەوە. بـەم پێیـەیش ئـەوا دەق —واتـە قورئان —دەکرێتە زادەی مێژوو، بـەمجۆرەش بـەهای وەحییبـوونی کـە لـە خـوای گەورەوە هاتبێتە خوارەوە، لە دەست دەدات). بەو مەبەستەی خاڵیی بکەنەوە لە ناوەرۆك و پەیامە خواییەکەی. ئەمانـە هـەرجارەو چـەمکێکی نـامۆ بـە کولتـوور و باوەڕی گەل و نیشتمانمان کە لە خۆرهەڵاتناسانیان وەرگرتووە، دەکەنە پۆشـاکی خۆیان، لە بەرانبەریشەوە هـزری عـەلمانی دەکەنـە قـەڵغانی خۆیـان و تـەواوکاری یەکترین.

ئـەم نەیارانـە لـە هـەموو لایـەك هـەمان وتـە و هـەمان پـلان و شـێواز و گوتـار دووبـارە دەکەنـەوە، ئەمـەیش هـەموو بـە پشـت ئەسـتووری و کۆمـەکی دەیـان و سەدان فەیلەسـوف و بیرمەنـد و دامـەزراوەی فیکریـی خۆرئـاوایی، کـە لـە پشـتی پەردەوە پشتگیرییان دەکەن. لە جیهـانی ئیسلامیشـدا کەسـانێ هـەن ناسـنامەی خۆیانیان سڕیوەتەوە، تا مامۆسـتا خۆرئاواییـەکانیان لێیـان ڕازی بـن. بـەڵام ئـەم

دەرگیرییە لەگەڵ کێدا؟ لەگـەڵ ئیسـلام و قورئـان و کولتوورێکـدا کـە بـە درێـژایی مێژووی خۆی دەیان و سەدان هەوڵی نەزۆکی لەمجۆرەی لەباربردووە و بە ویسـتی خوای گەورە هەتا دنیا دنیایە هەر وایش دەبێت...

ئەم هەوڵ و باسە پێکدێت لە سێ بەشی سەرەکی و بەمجۆرەی لای خوارەوە:

**بەشی یەکـەم:** لـەژێر ناونیشـانی: مێژوویـیـەتی گشـتگیر و مێژوویـیـەتی بـەش: پێکدێت لە سێ جێباس.

**بەشی دووەم:** بە ناونیشانی: دەروازەی زانستەکاتی قورئـانی پـیرۆز، ئـەمیش پێکدێت لە چوار جێباس.

**بەشی سێیەم:** کاردانەوەکانی مێژووییەتی لەسەر پەیامی قورئان: پێکـدێت لـە دوو جێبـاس. دواجـار کورتەیـەکی بابەتەکـە و پاشـتریش چـەند راسـپاردە و سەرچاوەیەك.

بەو ئومێدەی پەروەردگاری مەزن ئـەم هەوڵـە کـە لـە بنەڕەتـدا بـەری رەنجـی چەند بیرمەندێکی دڵسۆز و خـەمخۆری ئـەم ئایینـە پیرۆزەیـە، قبـووڵ بفـەرموێ و بچێتە پاڵ چەندین هەوڵی دڵسۆزانەی تـر و جێگـای خـۆی بگرێـت. خـوای گـەورە پشتیوان و یارمەتیدەر بێت.

# بەشی یەکەم:
# مێژووییەتی گشتگیر و مێژووییەتی بەش

## جیٚباسی یەکەم:
## چەمکی مێژووییەتی لە هزری نوێدا

**خواستی یەکەم:** واتای مێژوو لە زمان و لە رووی بەکارهێنانەوە (إصطلاحا):

(ئیبن مەنزور) لە پێناسەکردنی مێژوودا دەڵێ: مێژوو بریتییە لە پێناسـەکردنی کات[1].

لە لای (ئیبن خەلدوون) مێـژوو بریتییـە لـە (هەواڵـدان لـەبارەی گردبوونـەوەی مرۆیی کە ئەویش ئاوەدانکردنەوەی جیهانەو ئەو بارودۆخەیە کە دێـت بەسـەر ئـەو ئاوەدانکردنەوەیەدا)[2]. لە لای (توینبی)ش مێژوو: (ئەو زانستەیە کە باس لە ژیانی ئوممەتەکان و کۆمـەڵگا دەکـات، هـەروەها ئـەو پەیوەندییانـەی کـە لـە نێوانیانـدا پەیدا دەبێت)[3].

**خواستی دووەم:** چەمکی مێژووییەتی لای خۆرئاواییەکان:

لە هەردوو پێناسە پێشووەکەی ئـیبن خەلـدوون و توینبیـدا، چـەندین تـوخمی سەرەکی لە زانستی مێژوودا دەبینین. پێناسەکەی ئیبن خەلدوون وێنای بۆچوونی ئیسلامی بۆ مێژوو دەخاتەڕوو، شتی سەرەکی تێیدا ئەوەیە کە مێژوو هەواڵێکە لە هەواڵـەکان و دەبێـت بخرێتـە ژێـر پێـوەری دروسـتی و ڕاسـتگۆیی. پێناسـەکەی تـوینبیش وێنـای بۆچـوونی خۆرئـاوایی بـۆ زانسـتی مێـژوو دەکـات. بـەوەی کـە زانسـتێکە و بەشـێوەی سـەرەکی لەسـەر دروسـتیی هـەواڵ و پشـتگیرییەکەی دانامەزرێت، بەڵکو پشت بە ناوەڕۆکی هەواڵەکە و ئـەو زانیارییانـە دەبەسـتێت کـە

---

[1] لسان العرب، إبن منظور، ج١، ص٦٠.

[2] المقدمة، إبن خلدون، ص٢٧.

[3] المعجم الفلسفي، جميل صليبا، ص٢٢٧.

تێیدایه. بەراوردکردن و لێکۆڵینەوە و ڕەتکردنەوە، ڕۆڵی سەرەکی دەبینن لە پەسەندکردن یان ڕەتکردنەوەی هەواڵەکە. ئەم میتۆدە ناودەبرێت بە (میتۆدی ڕەتکردنەوە) یان (میتۆدی داخکردن). بەهرەمەندیی توێژەر و تواناکان و قووڵیی تێبینی و فراوانیی خەیاڵ و وردیی ویژدانی، کاریگەریی سەرەکییان هەیە لە جیاکردنەوە و دەرهێنانی زانیارییە مێژووییەکان [٤]. هەریەك لە (ترۆلیتش و مانهایم و دلقابی و فلدنبانت و دریکرت و کروتشە و غادامیر و هایدگەر و فیکۆ و هێردەر و ئالان تۆرین) پێناسەی مێژوویان کردووە و بە گشتی دەڵێن مێژوو تێڕوانینێکە دەڕوانێتە جیهان. بەو سیفەتە بواری کرداری مرۆڤە، کە تاکە بوونەوەرێکی هۆشمەندە لەم جیهانەدا، لە مرۆڤ بەولاوە بواری هیچ قسەکردنێك لەسەر مەعریفە یان شارەزاییەك نامێنێتەوە، ئەوە هەر مرۆڤە کە تاکە بوونەوەری مێژووییە [٥].

ئێستایش لە پاش خستنەڕووی پێناسەی مێژوو، دێینە سەر پێناسەی چەمکی مێژووییەتی:

(روبێر) دەڵێ: مێژووییەتی زاراوەیەکە دەگەڕێتەوە بۆ ساڵی / ١٩٣٧ز، پێناسەی دەکات بە: (ئەو بیروباوەڕەیە کە دەڵێت هەموو شتێك یان هەموو حەقیقەتێك لەگەڵ مێژوودا دەگۆڕێت. هەروەها گرنگی بە لێکۆڵینەوە لە شتەکان و ڕووداوەکان دەدات، ئەویش لە ڕێگای پەیوەستکردنیان بە بارودۆخە مێژووییەکانەوە)[٦]. موحەممەد ئەرەگۆن لەبارەی راستیی مێژووی سەرهەڵدانی ئەم زاراوەیە، بە پشتبەستن بە فەرهەنگی لارۆسی گەورە بە زمانی فەرەنسی، ڕوونی دەکاتەوە کە وشەی مێژووییەتی لە هزری خۆرئاواییدا لە ٦ / ٤ / ١٨٧٢ز کەوتووەتە ڕوو [٧].

---

[٤] مناهج البحث العلمي، عبدالرحمن بدوي، ص١٩ .

[٥] المعجم الفلسفي، د. عبدالمنعم حنفي، ص١٥.

[٦] الفكر الأسلامي قراءة علمية، أركون، ص١٣٩.

[٧] الفكر الأسلامي قراءة علمية، أركون، ص١١٦.

**خواستی سێیەم: چەمکی مێژووییەتی لە هزری عەرەبییدا:**

دەکرێ لە نووسینە عەرەبییە هاوچەرخەکاندا، مێژووییەتی دابنرێ بە وێنەی دەنگ و دەنگدانەوە، جگە لە جوینەوە و وتنەوەی ئەو گوتەیە کە دەیان ساڵە هزری خۆرئاوایی دەیلێتەوە، هیچی تری تێدا نییە. عەبدوڵڵا عەرەوی کۆنترین ڕۆشنبیری عەرەبییە لە کتێبەکەیدا بە ناوی (عەرەب و هزری مێژوویی)، کە لە ساڵی ١٩٣٧ز دەریکردووە[٨]، زاراوەی مێژووییەتی بەکارهێناوە و پشتگیریی لێکردووە. لە ساڵی ١٩٧٤زدا ئەرەگۆن لە توێژینەوەیەکیدا لە کۆنگرەیەك کە لە پاریس بەسترا، دەڵێ: (دەمەوێت ئەم خوێندنەوەیەم گرفتێك بخاتەڕوو کە هەرگیز پێشتر لە لایەن هزری ئیسلامییەوە بەم شێوەیە نەخراوەتەڕوو، ئەویش: مێژووییەتی قورئانە، پەیوەستکردنی مێژووییەتی قورئان بە ساتێکی زەمەنی و مێژوویی دیاریکراوەوە)[٩]. لە ساڵی ١٩٩٧زدا لە کۆنگرەیەك کە لە تونس گرێدرا، ئەرەگۆن باسی لە مەسەلەی مێژووییەتی کرد، گەیاندی کە پێویستە لەو چوارچێوەیەدا تێگەیشتن بۆ ئیسلام بکرێ[١٠]. نووسەرانی تری عەرەب وەك هاشم صالح و عەلی حەرب و ئەلربیعۆ و... تا دوایی، هەن، کە هاوشێوەی ئەم دووانەی پێشەوە هەر بەم دیدەوە ئەم مەسەلەیە دەورووژێنن.

[٨] العرب والفكر التأريخي، عبدالله العروي، ص٦٨.

[٩] الفكر الإسلامي قراءة علمية، أركون، ص٢١٢.

[١٠] هەمان سەرچاوەی پێشوو، ل١٣٨.

# جیّباسی دووەم:
# مێژوویەتی ئایینەکان

**خواستی یەکەم:** جۆرەکانی مێژوویەتی:

دکتۆر عەبدولوەهاب ئەلمەسیری دەڵێ: دوو جۆر مێژوویەتی هەیە:

**یەکەم:** مێژوویەتی گشتگیر: ئەوەیە کە گشت ئایینەکان [11] بریتین لە پرشنگی گەشەکردنی ئەقڵی مرۆڤ، ئا لێرەوە ئەوانەی کە دەڵێن ئیسلام یان قورئان زادەی مێژووە، ئەوا دەکەونە ژێر ئەم گشتگیرییەوە.

**دووەم:** مێژوویەتی بەش: مەبەستمان پێی مێژوویەتی هەندێ حوکمی شەرعییە، کە دەوترێت گوایا بۆ ئەم سەردەمە ناشێن [12].

**خواستی دووەم:** مێژوویەتی ئایینەکان لە هزری خۆرئاواییدا:

بۆ راڤەکردنی ئایینەکان، هزری خۆرئاوایی بە ئاراستەی راڤەکارییەکی ماددیی گەشەسەندوو، یان دەروونی، یان مێژووییدا رۆیشتووە، دوور لە هەر نادیار (غیب)ێك. هەریەك لە تۆماس هۆبز (١٥٨٨–١٦٧٩) و دیڤید هیوم و ئۆگست کۆنت و لسنج و سبنسەر (١٨٢٠–١٩٠٣) و کروتشە و سەنتیانا و دۆرکایم و فرۆید و ئەنگلز و داروین، بە گشتی. ئەم بۆچوونەی سەرەوەیان هەیە، بەڵام هەریەکەیان بە جۆرێ گوزارشی لێدەکات و یەك ئامانجیشیان هەیە، لێرەدا دەتوانین چەند قسەیەکی میانڕەوترینیان کە (گۆستاف لۆبۆن)ە، بهێنین تێیاندا، ئەو هۆکارانە روونده‌کاتەوە کە دەبنە هۆی پێکهێنانی ئایینەکان و لەم سێ فاکتەرەدا کورتیان دەکەینەوە:

١ـ حەزکردن لە ژیانی نەمریی ٢ـ ترس و ئومێدبوون ٣ـ حەزکردن لە جیهانی رۆژی دوایی [13].

---

[11] وانابینین جگە لە ئیسلام هیچ یەك لە ئایینەکانی تر لەسەر حەقیقەتی خۆیان مابن.

[12] العلمانية تحت المجهر، د. عبدالوهاب المسيري.

به بۆچوونی ئەو، ناتوانرێ به ئەقڵ ئایینەکان لێك بدرێنەوه، چونکه ئایینەکان پشت بـه سـێ پێگـه دەبەسـتن کـه ئـەقڵ هـیچ یـەك لـەو پێگانـه نییـه، ئـەوانیش ئەمانەن: باوەڕ، پەرستشەکان، بـوونی کەسـانی کاریزمـا[14]. دەردە دەروونییـەکان که له نەستدا دروست دەبن، وادەکەن کـه خـەڵکی ئایینـەکان قبـووڵ بکـەن بـەبێ ئەوەی هیچ پێویستییەکی به بەڵگه و سەلماندن هەبێت [15].

**خواستی سێیەم:** مێژوویی‌ەتی ئایینەکان له هزری عەرەبیدا:

لەسـەر گەشـەکردنی ئایینـەکان قسـەی زۆر کـراوه، لێـرەدا ئامـاژه بـه توندڕەوترینی ئـەو بۆچـوونانه دەدەیـن، ئـەویش بۆچـوونی (ئەبولقاسـم حـاج حەمـەد)ه، کـه یەکێکیانـه و دابەشـکردنەکەی (کۆنـت)ی بـۆ مێـژووی مرۆڤایـەتی لەگـەڵ کـەمێك گـۆڕان بەسـەرهێناندا، پیـادە کـردووه. ئـەبولقاسمیش رای وایـه مرۆڤایەتی به سێ دۆخدا تێپەڕیوه:

**دۆخی یەکەم:** ئەقڵیەتی ئەنیمی: نزمترین پلەی هۆشیاریی ئـەقڵی مرۆییـه. تـا سەردەمی ئیبراهیم پێغەمبەر (سەلامی خوای لەسەر بێت) و بەشێك له ژیانی ئـەو، بەردەوام بوو. **دۆخی دووەم:** دۆخی دوالیزمییەکان: کـه موسـا و عیسـا پێغەمبـەر (سەلامی خوایان لەسەر بێت) پێیدا تێپەڕین، پاشتریش سەردەمی پێغەمبەرایـەتی موحەممەدە تا ئەمڕۆ. **دۆخی سێیەم:** سەدەی پانزەهـەمی کۆچییه و جیهـانێتیی ئیسلامی دووەم دەستپێدەکات[16].

زەکی نەجیب مەحموود، دەڵـێ: ئـایین و زانسـت دوو شـتی نـەیارن بـه یـەك و هەریەکەیان بواری خۆی هەیه[17].. به گوتەی ئەو، ئایین جیهانی گومانه، کـه قسـه

---

[13] الفكر الاسلامي قراءة علمية، أركون، ص٢٤.

[14] هەمان سەرچاوه، ل٣٢.

[15] هەمان سەرچاوه، ل٧٧.

[16] العالمية الإسلامية الثانية، أبو القاسم حاج حمد، ٤٧٨/٢ .

[17] تجديد الفكر العربي، زكي نجيب محمود، ص١٣٥.

پێشووەکەی (سنتیانا)مان بیردەکەوێتەوە کە دەڵێ: باوەڕ هەڵەیەکی جوانە!!!
نەوال سەعداوی و چەندینی تریش لە هاوشێوەی خۆی هەن کە بە هەمان ئاراستە قسە دەکەن. هاوکات زۆرێك لە توێژەران هەوڵدەدەن وێکچوون لە نێوان باوەڕە ئایینییەکاندا بسەلمێنن، بەو مەبەستەی بگەنە ئەو دەرئەنجامەی کە ئایینەکان دەستکردی مرۆڤن، وەك سەید مەحموود قومەنی و تورکی عەلی ئەلربیع، یەکەمیان بەراورد دەکات لە نێوان چیرۆکی دروستبوون لە تەوراتدا و چیرۆکی دروستبوون لە (سفر التكوين)ی سۆمەری و بابلیدا.

**خواستی چوارەم:** مشتومڕ و ڕەخنە:

نووسەرە ماددییەکان بە مەبەستی تایبەتیی خۆیان دەگەڕێن بەدوای ریشك و گەشەکردن و شێوە و دیاردەی ئایینەکاندا و جۆری وێکچوونیان. بەڵێ نموونەی زۆر هەن لەسەر وێکچوون و هاوتابوون لەنێو بیروباوەڕی گەلان و ئوممەتەکاندا، ئەمەیش دەبێتە هۆی زیادکردنی باوەڕ لای باوەڕداران و هاوکات زیاترکردنی بێباوەڕی لە بێباوەڕاندا. (إِنَّ اللَّهَ لاَ يَسْتَحْيِي أَن يَضْرِبَ مَثَلاً مَّا بَعُوضَةً فَمَا فَوْقَهَا فَأَمَّا الَّذِينَ آمَنُواْ فَيَعْلَمُونَ أَنَّهُ الْحَقُّ مِن رَّبِّهِمْ وَأَمَّا الَّذِينَ كَفَرُواْ فَيَقُولُونَ مَاذَا أَرَادَ اللَّهُ بِهَذَا مَثَلاً يُضِلُّ بِهِ كَثِيراً وَيَهْدِي بِهِ كَثِيراً وَمَا يُضِلُّ بِهِ إِلاَّ الْفَاسِقِينَ) (البقرة: ٢٦).

لەبەرئەوە هەر وێکچوونێك کە لەنێوان بیروباوەڕە ئاسمانییەکانی گەلاندا هەیە، بۆ ئەوە دەگەڕێتەوە کە هەموو بیروباوەڕەکان لە یەك سەرچاوەوە دەرچوون. مەعلومە کە هەموو یاسا ئاسمانییەکان راست و دروست و دادپەروەرن، هەر لە یەکەمیانەوە تا پەیامی پیرۆزی ئیسلام، ئەمەیش رێگری لەوە ناکات کە هەندێ لە حوکمەکانیان وابەستە بکرێن بە بارودۆخی رابردوویانەوە [١٨]

هەموو ئەو شتە پڕوپووچ و ئەفسانانەیش کە تێیاندان، خەڵکی زیادی کردوون و لە دایکبووی خەیاڵن و ئەو گۆڕانانەیە کە لێیان تێناگەن و بەهۆیانەوە موزایەدە

---

[١٨] الدين، درّاز، ص٨٤.

دەکەن بەسەر وەحیی خواییەوە. لە راستیدا ئایینەکان یەکن و لە ئیسلامدا کۆدەبنەوە (إِنَّ الدِّينَ عِندَ اللّهِ الإِسْلاَمُ) (آل عمران: ١٩). ئەوانەیش کە قەناعەتیان بە بیرۆکەی گەشەکردنی ئایینەکان هەیە، لە بتپەرستییەوە بۆ یەکتاپەرستی، یان لە ئەفسانەیی و رۆحییەوە بۆ ئەقلانیەت و دواتریش واقیعیەت، هەروەك کۆنت دەڵێ [١٩]، ئەوا بەو کەسانە دەوترێ: واقیع دەیسەلمێنێ (ئەو سێ حاڵەتەی کە کۆنت وێنایان دەکات ئەوە ناگەیەنێ کە قۆناغە مێژووییەکان یەك لەدوای یەك بن، بەڵکو بۆچوون و حەز و تەوژمی سەردەمین لە گەلاندا. ئەو سێ دۆخەیش بە بەردەوامی لە یەك پلەی گەشەکردن یان دامرکاندنەوەدا نین لە گەلاندا. ئەوەیش دەڵێین کە ئەو سێ رەوتە لە دەروونی هەمان تاکدا لە یەکەوە نزیکن، هەندێکیشیان ئەرکی خۆی هەیە لە بەرپاکردنی مرۆڤایەتی و لەسەر پێ وەستانی و تەواوکاری یەکترین. هەریەکەیشیان بواری گونجاو بە خۆی هەیە. گەشەکردنە دەرکپێکراوە ئەقلییەکانیش پێویستییە سروشتییەکانی دەروونی مرۆڤایەتی لانابەن. لەم سەردەمەیشدا کە زانستەکان گەیشتوونەتە پلەیەکی بەرز، ئەوا لە لای ئەو ئەقلانەی کە برشتیان بەرزە، هەر دینداری بەدی دەکەین، هەروەك (رینان) دەڵێ: دەکرێ هەموو شت لەناو بچێت و نەمێنێ، بەڵام مەحاڵە دینداری بسرێتەوە [٢٠].

---

[١٩] الدین، درّاز، ص٨٤ .

[٢٠] الدین، درّاز، ص٨٧.

# جێباسی سێیەم:
# مێژووییەتی قورئان

**خواستی یەکەم:** دەرهێنانی مانایەکی ورد و پڕاوپڕ:

هەموو ئەو نووسەرە عەرەبانەی کە بە دیدێکی ماددی دەڕواننە مەسەلەکان، قسەیان لەسەر مێژووییەتی قورئان کردووە. لێرەدا ئاماژەمان بە چەند کەسێکیان کردووە کە بۆ مەبەستەکەی خۆیان دەبنە تەواوکاری یەکتری و بە یەک ئاراستە و ئامانجدا هەنگاو هەڵدەگرن. مێژووییەتی دەق لای ئەوانە بەو مانایە دێت کە دەقەکە ببەسترێتەوە بەو واقیع و زروفەوە کە تێیدا دابەزیوە، بە جۆرێ کە هۆکارەکانی هاتنەخوارەوە یەکسان بن بە مێژووییەتی و گوزارشت لە حەقیقەت و لە ماناکەی بکەن [٢١]. بەم پێیەش: ڕێنماییە پیرۆزەکانی قورئان، باوەڕە ئیسلامییەکان، سوننەتی پێغەمبەر (ﷺ) [٢٢]، مێژووییەتی هزر، مێژووییەتی شەریعەت [٢٣]، پەیوەستن بە بارودۆخی مێژووییەوە [٢٤]. ئەرەگۆن دەڵێ: نابێت دەقەکان لە سەرووی کات و شوێنەوە بن [٢٥]. هاشم صالح دەڵێ: (مێژووییەتی لێرەدا واتە خستنەڕووی مێژووییەتی گوتاری قورئانی، ئەویش لە ڕێگای بەستنەوەی بە ژینگەی جوگرافی و سروشتی و مرۆڤی خێڵەکییەوە لە نیوە دوورگەی عەرەبی و لە سەدەی حەوتەمی زایینیدا) [٢٦]. کەواتە دەتوانین بڵێین ئەم گوتەیەی هاشم صالح بە ڕوونی پڕاوپڕ مەبەستەکەی پێکاوە، دیارە کە ئەمیش

---

[٢١] العقل في الاسلام، العشماوي، ص٦٩.

[٢٢] نحو أصول جديدة للفقه الاسلامي، محمد شحرور، ص١٢٥.

[٢٣] نحن والتراث، الجابري، ص٢٩.

[٢٤] تأريخية الفكر، أركون، ص١٢٦.

[٢٥] القرآن من التفسير الموروث، أركون، ص١٤.

[٢٦] هەمان سەرچاوەی پێشوو، أركون، ل٢١.

هەر ئەوە ڕووندەکاتەوە کە ئەرەگۆن لە نووسینەکانیدا بە ڕستەی چڕوپڕتر و گشتگیرتر گوزارشی لێکردووە.

**خواستی دووەم:** دەستپێشخەری لە گوتنی مێژوویيەتی:

ئەرەگۆن لە کۆنگرەیەکدا کە لە ساڵی ١٩٧٤ز لە پاریس گرێدراوە[٢٧]، ئەم مەسەلەیەی وروژاندووە. لەم گوتارەیدا ئەرەگۆن دوو بیرۆکەی نوێی خستووەتە ڕوو: ١- بەکارهێنانی بیرۆکەی مێژوویيەتی و خستنیە پاڵ قورئانی پیرۆز. ٢- گشتگیریی ئەو مێژوویيەتەیە بۆ هەموو ناوەرۆکی قورئانی پیرۆز. بەمشێوەیەش ئەرەگۆن دەستپێشخەر و ڕوونکەرەوەی مەبەستی مێژوویيەتییە. هەر ئەم چاولێکەرانە لەسەر هەمان تەرز هاتن، بۆچوونەکانی (قاسم ئەمین) لە میسر و (تاهیر حەداد)یان لە تونس، لەبارەی ئافرەتەوە، قۆستەوە. نەصر حامید ئەبو زەیدیش لە فەیلەسوفی ئەمریکی (هیرش)ەوە دەیگوێزێتەوە [٢٨]، عەبدولعەزیز سەعالبیش ١٨٧٤ – ١٩٤٤ز، هەر بە هەمان ئاراستەدا قسە دەکات.

ئیتر جگە لەوە کە لە گوتنی مێژوویيەتییدا فرت و فێڵ بەدی دەکرێت و یاریکردنە بە ئەقڵی خەڵکی، وەك ئەبو زەید کە دەڵێ: (ئەگەر لە دووتوێی لێکۆڵینەوەیەکی قووڵدا بۆ بونیادی دەقەکان، دەقی ئەحکامەکانمان خوێندەوە....لەوانەیە ئەو خوێندنەوە مێژوویيە زۆرێك لەو ئەحکامە شەرعییانە لەکاربخات، بەو سیفەتە کە ئەحکامی مێژوويين و زیاتر وەسفی واقیعیان کردووە نەك وەها کە یاسایەکی شەرعی دروست بکەن) [٢٩]. لێرەدا دەڵێ مێژوویيەتی ئەو ئەحکامانەی لەکارخستووە، کەچی لەولاوە دەڵێ مەبەست بە مێژوویيەتی ئەوە نییە پرنسیپی مانا و واتای گشتگیر (عموم الدلالة) بڕووخێنێ، ئایا ئەبوزەید

[٢٧] بڕوانە لاپەرە (٣).

[٢٨] إشكاليات القراءة وآليات التأويل، أبو زيد، ص٤٨.

[٢٩] هەمان سەرچاوەی پێشوو، ل١٣٩.

کـام لـەم دوو واتایـەی مەبەسـتە؟ لـە کاتێکـدا مێژووییـەتی لای ئـەو و رێـژەیی و زەمانی و کاتی، کۆمەڵە زاراوەیەکن بەرانبەر بە رەهایین، نابێ قورئانیش هـەڵگری هیچ یەك لەوانە بێت [٣٠].

**خواستی سێیەم:** مێژووییەتی فاشیزمی ڕەها:

ئەم گوتارە ماددییـە دروشمـی: (قورئـان شـیاوە بـۆ هـەموو کـات و شـوێنێك) دادەنێ بە وڕێنەیەکی میتافیزیکی[٣١]. حەسەن حەنەفی دەڵێ: (دەق– وەحی– بـە تەنها خۆی هیچ شتێك ناسەلمێنێ، رستەی خوا دەڵێ و پێغەمبـەر دەڵـێ دانـانرێن بە بەڵگە) [٣٢].

ئەبوزەید دەڵێ: (هەتا ئەقڵ ڕزگاری نەبێت لە دەستەڵاتی دەقـە ئایینییـەکان، ڕزگاربوون نییە)[٣٣]. لێرەوە بڕیاری پێشتر بۆ داڕێـژراوی خۆیـان دەدەن کـە تـەنها مێژووییەتی چارەسەرە.

ئەرەگۆن دەڵێ: (دەبێت بە تەواوەتی ڕێگری بکرێت لەوە کە لەپێناو یاریکردن بە ڕابردوو بە مەبەستی ئایدیۆلۆژی، پەنا ببرێت بۆ بە هەڵە زانینی مێژووییەتی) [٣٤] ئیسـلام و قورئـان هـەردووکیان ڕووداوی مێـژووین[٣٥]. بـە مێژوییـەتی ڕزگارمـان دەبێت لەو توندوتیژییە کە پێی دەوترێت خەباتی بچووک (الجهاد الاصـغر)[٣٦]، (بـە مێژووییـەتی) ڕزگارمـان دەبێـت لـە ئـەرکی پەرستشـی دەقـە خوێنـدراوەکان، لـە

---

[٣٠] النص، السلطة، الحقيقة، أبو زيد، ص١٢٠.

[٣١] النص القرآني، طيب تيزيني، ص١١٥.

[٣٢] دراسات إسلامية، حسن حنفي، ص٥١.

[٣٣] الخطاب والتأويل، أبو زيد، ص١٤٣ .

[٣٤] القرآن من التفسير الموروث، أركون، ص٧٧.

[٣٥] نقد الخطاب الديني، أبو زيد، ص٩٩.

[٣٦] القرآن من التفسير الموروث....، أركون، ص٥٨.

(گەڕانــەوە بــۆ نموونــەی پێغەمبەرایــەتی و چــەندینی تــریش) [37]. ئایــا ئەمــە تیرۆرکردنــی زانســت و هــزر نییــە، کــە ئــەم گوتــارە بــە راســت و چــەپدا و بــە باگراوندێکی فیکری بڕیاری پێشتر دەدات بەســەر هــەموو نەگۆڕەکانـدا و هــەر رای خۆی بە جێگیر و نەگۆڕ دەزانێت؟

جا کەسێ بواری هەبێت و بتوانێت بچێتە نێـو قووڵاییەکانـەوە، ئـەوا چـەندین پێگەی ماددی و بنەمای دەستکردی فیکری دەبینێت کە لـە دوو تێڕوانینـەوە ئـەو مێژووییەتییــە بەرهــەم دەهێنێــنن، یەکــەم: دەروازە گوماناوییــە ئاشــکراکانی مێژووییــەتی، کــە ئەمانــەن: ١ــ دەروازەی ئوســوڵی ٢ ــ دەروازەی کــەلامی (عەقیدەناسی) ٣ـ دەروازەی زانستەکانی قورئان ٤ ـ دەروازەی مۆدێرنەیی.

دووەم: بنەما حەقیقییەکانی مێژووییەتی کە ئەمانەن: ١ـ ڕەوتـی مرۆڤگـەرایی ٢ــ ڕەوتــی مارکســیزم ٣ــ ڕەوتــی خوێندنــەوەی شــێوێنەر (هێرمینۆتیکــا) ٤ــ کاردانەوەکانی مێژووییەتی لەسەر پەیامی قورئان.

کە هەریەك لەم دەروازانە چەندین گومانی لەسەر دروستکراوە، هاوکات زانایان چــەندین وەڵامــی شــیاویان داونەتــەوە، ئێمــەیش لێـرەدا وەك نموونەیـەك لەســەر گومانەکانی بەناو مێژووییەتی، بە پشتیوانیی خوای گەورە قسە لەســەر دەروازەی زانستەکانی قورئان دەکەین.

---

[37] القرآن من التفسير الموروث.....، أركون، ص٥٥.

# بەشی دووەم:
# دەروازەی زانستەکانی قورئان

## سەرەتا:

یەکێك لەو میکانیزمانەی کە خراوەتەگەڕ بۆ خزمەتکردنی دەق، تا پێشەنگیی خۆی بکات و جووڵەکانی ژیان ئاراستە بکات، زانستەکانی قورئانە (وەك: لەکارخستن — النسخ —، هۆیەکانی هاتنە خوارەوە، مەککی و مەدەنی، پلەبەندی لە کۆکردنەوەدا، خوێندنەوەکان). چونکە ئەو قورئانە پەیامی خوای گەورەیە بۆ مرۆڤەکان، ئەو خەمەیش کە پاڵی بە موسڵمانانەوە ناوە بۆ ئەم کارە، (خەمی مەعریفی) [38] بووە. داینەمۆی خوێندنەوەکەیش لەسەر واتاکانی دەق و ئەو مانایانەی کە بەدەستیانەوە دەدات (بریتی بووە لە دۆزینەوە و سۆراخ کردن و توێژینەوە) [39]. (هەموو ئەم زانستانەیش لە لایەن موسڵمانانەوە لەبەرئەنجامی حەز و خولیای زانستییەوە نەهاتوون، بەڵکو لەبەرئەنجامی ئەوەوە هاتوون کە پێویستییەك هەبووە و سروشت و لێکۆڵینەوەی ئەم پەڕاوە پیرۆزە ئەوەی خواستووە.... چونکە قورئان پەڕاوی پەرستشەکان و ژیانە) [40]

ئەی ئایا خۆرهەڵاتناسان و چاولێکەرانیان چییان لە زانستەکانی قورئان دەوێت؟

لای ئەوانە زانستەکانی قورئان ئەوەیان لێ دەویسترێ ببنە بناغەیەك تا موسڵمانان ڕام بکرێن لەسەر پەسەنکردنی مێژوویيەتی دەق، ئەبوزەید دەڵێ: (لە گرنگترینی ئەو زانستانەیش کە پەیوەندییان بە چەمکی مێژوویيەتی دەقەکانەوە

---

[38] إشكالية قراءة النص، إلياس قويسم، ص٦٤.

[39] هەمان سەرچاوەی پێشوو.

[40] أسباب النزول، د. عماد الدين رشيد، ص٢.

هەیە، زانستەکانی مەککی و مەدەنی و لەکارخەر و لەکارخراون)[41]. مەبەستیش ئەوەیە تا ڕەوایەتییەکی ئیسلامی بدرێت بەسەر خوێندنەوە عەلمانییەکەدا. بەڵام گرفتەکە لەوەدایە کاتێ ئەمانە ئەم تەوەرانە دەخەنەڕوو، تەنها بەشە دنیاپەرستییەکە دەبینن تێیاندا، خۆیان بێئاگا دەکەن لە تەوەرەی سەرەکی کە پەیوەستە بە مرۆڤەوە لە قورئاندا، ئەویش تەوەرەی غەیبی و دوارۆژە. فەرامۆشی دەکەن و نکوڵیی لێدەکەن، دەیانەوێت ئەم تەوەرەیە لە دەقەکەدا لاببرێت.

## جێباسی یەکەم:
## هۆیەکانی هاتنەخوارەوەی قورئان

**خواستی یەکەم:** هەڵوێستی نەیارانی ئیسلام کە دەڵێن: (هۆیەکانی هاتنەخوارەوە چەسپێنەری مێژووییەتین):

حەسەن حەنەفی دەڵێ: ئەوەی کە پێشینان بە ناوی هۆیەکانی هاتنەخوارەوە گوزارشیان لێکردووە، لەڕاستیدا پێشینەیی واقیعە بەسەر هزردا و بانگکردنی هزرە بۆ لای خۆی[42]، جا ئەگەر وشەی (نزول) بە مانای هاتنەخوارەوە بێت لەسەرەوە بۆ خوارەوە، ئەوا وشەی (هۆکار) بەرزبوونەوە دەگەیەنێت لە خوارەوە بۆ سەرەوە، تا هۆکاریش ڕوویدابێت ئایەتی قورئان هاتووەتە خوارەوە، کەواتە خوارووەکە مەرجە بۆ بوونی سەرووەکە[43].

لە تێڕوانینی زۆرێک لەو نووسەرە عەلمانییانەوە، گرنگییەکە خۆی لە هۆیەکانی هاتنەخوارەوەدا دەبینێتەوە، وەك عەشماوی کە دەڵێ: دەبێتە هۆی

---

[41] نقد الخطاب الديني، أبو زيد، ص٢٠٦.

[42] التراث و التجديد، حسن حنفي، ص١٣.

[43] الوحي والواقع، حسن حنفي، ١/٢٠.

(واقیعیبوونی ئایەتەکانی قورئان، لە مێژوویی بوونیشیدا کۆتایی دێت، ئەوەیش دەسەپێنێ کە بیانبەستێتەوە بە ڕووداوەکانەوە، دواتریش دەبێ قورئان بە هۆیەکانی هاتنەخوارەوەی ڕاڤە بکرێت نەك بە گشتگیریی لەفزەکانی)[٤٤]. هەروەها دەڵێ: (جگە لە سورەتە یەکەمەکان، ئیتر هیچ ئایەتێك بەبێ هۆ نەهاتووەتە خوارەوە)[٤٥] حەسەن حەنەفی دەڵێ: بەڵکو قورئان گرنگێتیی واقیعی داوە بەسەر هزردا، کە مەبەستی ئەوەیە یەکەمجار هۆکاری دابەزینەکە هەبووە ئینجا ئایەتەکە هاتووەتە خوارەوە[٤٦]. ئەمەیش لای حەنەفی ئەوە دەگەیەنێت کە ڕووداوەکان دەقەکانی بەرهەمهێناوە[٤٧]. پاشتریش مادامێ واقیع بەردەوام لە گۆڕاندایە، بەڵام دەقەکان نەگۆڕ و دۆگمان، ئەوا هیچ مانایەك نامێنێ بۆ مانەوە لە چوارچێوەی دەقەکاندا، چونکە (خوا دەڵێ و پێغەمبەر دەڵێ، ناکرێنە بەڵگە)[٤٨].

لەڕاستیدا ئەمە ڕووخاندنی ئیسلامە، بەڵام بە بەکارهێنانی چەکوشێك کە دروشمی (لاإله إلا الله) هەڵدەگرێت.

**خواستی دووەم:** بەدواداچوون و ڕەخنە:

ئایا ڕاستە کە هەموو ئایەتەکانی قورئانی پیرۆز بە هۆکارەوە هاتوونەتە خوارەوە؟:

ئەم گوتارە دەڵێ هەموو ئایەتەکانی قورئان هۆکاری هاتنەخوارەوەی خۆیانیان هەیە، یان ئەو ئایەتانەی کە بەبێ هۆکار هاتوونەتە خوارەوە زۆر کەمن. لێرەوە بناغە دادەنێ بۆ ئەوەی کە بڵێ قورئان مێژووییە، گوایا لەمەیشدا پشت دەبەستێت بە بەڵگەی واقیعیی هەستپێکراو و دیار کە ناکرێ نکوڵییان لێبکرێت.

---

[٤٤] تحديث العقل الإسلامي، العشماوي.

[٤٥] أصول الشريعة، العشماوي، ص٦٥.

[٤٦] في فكرنا المعاصر، حسن حنفي، ص١٢٦.

[٤٧] هەمان سەرچاوەی پێشوو.

[٤٨] دراسات إسلامية، حسن حنفي، ص٥١.

با ئێستە بزانین ئایا ئەو قسانە ڕاستن یان جۆرێکە لە سەرەڕۆیی و خوێندنەوە و بڕیاری سەرپێیی. ئەم زانیارییەی خوارەوە کە دکتـۆر (موحەممـەد عـەممارە)[49] ئامادەی کردووە، بە ڕوونی ئەوە دەخاتەڕوو، دەڵێ:

ئەم گوتارە ناحەزە، قێزەونترین جۆرەکانی خیانـەتی زانسـتی ئەنجامـدەدات، فێڵ لە خوێنەرانیش دەکات، چـونکە (واقیعـی هەسـتپێکراو و دیـار و سـەرژمێری، دەیسەلمێنن ئـەو قورئانـەی کـە لەسـەری دەوتـرێ گوایـا هـەمووی بـە هۆکـارەوە هاتووەتــە خــوارەوە، ئــەوا تــەنها ڕێــژەی (٧,٥٪) لــە ئایەتــەکانی قورئــان پێکدەهێنێت، چونکە کۆی گشتیی ئایەتەکانی قورئان ژمارەیان (٦٢٣٦) ئایەتە و لای وردبینەکان و توێژەران تەنها (٤٧٢) ئایەت هۆکاری دابەزینیان هەیە، واتە بـە ڕێـژەی (٧,٥٪)ی ئایەتـەکانی قورئـانن. لـە لای ئەوانـەیش کـە زۆریـان وتـووە و ئاسانکارییان کردووە، ئەوا لە (٨٨٨) ئایەت تێناپـەڕێت، واتـە بەڕێـژەی (١٤٪)ی ئایەتــەکانی قورئــان[50]. هــەموو ئەمــەیش ئــەوە دەگەیــەنێت کــە (حەقیقەتــە هەستپێکراو و دیارەکان) ئەوە دەسەلمێنن کە زیاتر لە (٩٠٪) ئایەتەکانی قورئان، لە سەرەتاوە بەبێ هۆ هاتوونەتە خوارەوە [51].

**خواستی سێیەم:** ئایا پەند لە گشتگیریی لەفزەکەدایە یان لـە تایبەتمەنـدێتیی هۆیەکەدا؟:

**یەکەم:** هەڵوێستی ئەو نەیارانە کە دەم لەم مەسەلەیە دەکوتن:

ئەم گوتارە، ئەو ڕێسا ئوسوڵییە ناودارە کە دەڵێت: (پەندەکـە لـە گشـتگیریی لەفزەکەدایە، نـەك لـە تایبەتمەنـدێتیی هۆیەکـەدا) کـە یـەکێکیان عەشماوییـە، بـە ڕێسایەکی دروستکراو و ترسناك دادەنێت و دەڵێ: لە قۆناغی تاریکیی ژیارەکـان و

[49] سقوط الغلو العلماني، د. محمد عمارة، ص٢٦٢.

[50] سقوط الغلو العلماني، د. عمارة ، ص٢٥٤- ٢٥٥.

[51] إشكالية قراءة النص، إلياس قويسم، ص٦٩.

داڕووخانی ئەقڵی و چەرخە دواکەوتووەکاندا پەیدا بووە[52]. هەروەها دەڵێ: لەو نموونانەیش کە لە مێژووی هاوچەرخماندا هەیە، پاساو هێنانەوەی پیاوانی ئایینییە بۆ بۆچوونی حکومەتە دژبەیەکەکان[53]. ئەبوزەیدیش دەڵێ: (دەستگرتنیش بە گشتگیریی لەفزەکەوە لەگەڵ بەفیڕۆدانی تایبەتمەندێتیی هۆیەکە، دەرئەنجامی مەترسیداری لێدەکەوێتەوە. ترسناکترینیان ئەوەیە کە دەبێتە هۆی بە فیڕۆدانی حیکمەتی قۆناغبەندی لە یاسادانانداا، لە مەسەلەکانی حەڵاڵ و حەرام لە بواری خواردن و خواردنەوەدا)[54].

**دووەم:** بەدواداچوون و ڕەخنە:

ئەم مەسەلەیە لەنێو زانایاندا قسەی زۆر و چەندین بەرگی لەسەر نووسراوە، لێرەدا پوختەی مەسەلەکە بەمجۆرە دەخەینەڕوو:

١ – دەرخستنی شوێنی ناکۆکییەکە:

جیاوازیی لە نێوان زانایاندا دەربارەی ڕێساکە، واتە (پەند لە گشتگیریی لەفزەکەدایە نەك لە تایبەتمەندێتی هۆیەکەدا)، تەنها یەك شێوە لە شێوەکانی پەیوەندی لە نێوان دەقەکە و هۆیەکانی هاتنەخوارەوەدا لەخۆ دەگرێ نەك لە هەموو شێوەکاندا، ئەو شێوەیەیش ئەوەیە کە ئەگەر هاتوو دەقەکە گشتی بێت و هۆی هاتنەخوارەوەکە تایبەت بێت، بەڵام ئەگەر دەقەکە گشتی بێت و هۆی دابەزینەکەیش هەر گشتی بێت، ئەوا بە کۆدەنگیی زانایان، گشتگیرییەکە لەبەرچاو دەگیرێت، هەروەك خوای گەورە دەفەرموێت: (وَلاَ تَحْسَبَنَّ الَّذِينَ قُتِلُواْ فِي سَبِيلِ اللّهِ أَمْوَاتاً) (آل عمران: ١٦٩).

---

[52] معالم الاسلام، العشماوي، ص٦٤.

[53] أصول الشريعة ، العشماوي، ص٧٠.

[54] مفهوم النص، أبو زيد، ص١١٧.

هەروەها کۆدەنگیی هەیە لەسەر تایبەتکردنیش، ئەگەر هاتوو لەفزەکە تایبەت بوو و هۆی هاتنەخوارەوەیش هەر تایبەت بوو و مەبەست و بەڵگەیش لەسەر تایبەتکردنەکە هەبێت، ئەوا بێگرفتە و کۆدەنگیی لەسەرە[55].

ئەم بابەتە لەنێو زانایاندا قسەی زۆری لەسەر کراوە، لێرەدا تەنها گوتەیەکی (ئیبن تەیمیە) — ڕەحمەتی خوای لەسەر بێت — دێنین، کە ڕاستێتیی ناکۆکی لە نێوان ئەوانەی کە ئیقرار بە گشتگیریی لەفزەکە دەکەن و ئەوانەی ئیقرار بە تایبەتکردنی هۆیەکە دەکەن، ڕووندەکاتەوە و دەڵێ: (ئەوانە زۆر جار قسەکەیان لەو بەشەوە دێت کە دەڵێن: ئەم ئایەتە لە فلانە شتدا هاتووەتە خوارەوە، بەتایبەتی ئەگەر ناوبراوەکە کەسێکی دیاریکراو بێت، وەك هۆی هاتنەخوارەوەی ئەو ئایەتانە کە لە تەفسیردا باسکراون: وەك دەڵێن: ئایەتی (الظهار) لەبارەی هاوسەرەکەی سابیتی کوڕی قەیسی کوڕی شەمماسەوە هاتووە، یان ئایەتی (اللّعان) دەربارەی عویمەر عەجلانی یان هیلالی کوڕی ئومییە هاتووە، ئایەتی (الکلالة) دەربارەی جابیری کوڕی عەبدوڵڵا هاتووە – چەندین نموونەی تریشی هێناوەتەوە– پاشان دەڵێ: ئەوانەی کە دەڵێن (پەندەکە لە تایبەتکردنی هۆیەکەدایە) مەبەستیان ئەوە نەبووە کە حوکمی ئایەتەکە تایبەتە بەو کەسایەتییانەو کەسیتر ناگرێتەوە، چونکە ئەم قسەیە نە موسڵمان و نە ئاقڵ بە هیچ جۆر نایڵێن، ئینجا ئەگەر خەڵکیش ناکۆك بوون لەو لەفزە گشتییەدا کە لە هۆیەکەدا هاتووە، ئایا بە تەنها تایبەت دەکرێت بە هۆیەکەیەوە؟ ئەوا هیچ یەك لە زانایانی موسڵمان نەیانوتووە کە شتە گشتگیرەکانی قورئان و سوننەت تایبەت دەکرێن بە کەسێکی دیاریکراوەوە، بەڵکو ئەوپەڕی قسەیەك کە کردوویانە، وتوویانە: ئەو ئایەتە تایبەت دەکرێت بە جۆری ئەو کەسەوە کە هاوشێوەی ئەویشە و گشتاندنەکە دەیگرێتەوە. گشتاندنەکەیش تەنها لە لەفزەکەوە نایەت،

[55] أسباب النزول....، د. عماد الدين رشيد، ص٣٠٦.

ئەو ئایەتەیش کە هۆکارێکی هاتنەخوارەوەی دیاریکراوی هەیە، با فـەرمانێك بێت بە چاکە یان ڕێگری کردن بێت لە خراپە، ئـەوا ئـەو کەسـە دیـاریکراوە و کەسـانی تری هاوشـێوەی ئـەویش دەگرێتـەوە. ئەگـەر هـەواڵێکی دەستخۆشـی کـردن یـان سەرزەنشت کردن بێت، ئەوا ئەو کەسە و کەسانی تریش دەگرێتەوە کە لە ئاسـتی ئەو و هاوشـێوەی ئـەودا بـن)[56]. کەواتـە لـە زۆربـەی زۆری حاڵەتەکانـدا پەنـد لـە گشـتگیریی لەفزەکەدایـە نـەك لـە تایبـەتکردنی هۆیەکـەدا، ئـەوەیش کـە نـەیاران دەیڵێن خۆدزینەوەیە لە ڕاستییەك کە زانایان کۆدەنگن لەسەری و ئەمانە دێـن بـە ناڕەوا بەرگی بەرژەوەندیی ئیسلامی لەبەردەکەن.

٢– بەڵگەی ئەوانە کە ئیقرار بە تایبەتکردنی هۆیەکە دەکەن:

ئایا ئەو گوتارە نەیارە، بەڵگەی هەیە لـە ئیقرارکردنـی ڕێچـکەی (پەندەکـە لـە تایبەتکردنی هۆیەکەدایە)؟

ئەم گوتارە زۆربەی جار نەریتی وایـە کـە بەڵگـە ناهێنێتـەوە، چـونکە هـەر لـە بنەڕەتـەوە گرنگـی نـادات بـە بونیادنـان، بـەڵکو تـەواوی هەوڵـەکانی خـۆی لـە ڕووخاندندا چڕدەکاتەوە. شـەرمیش نـایگرێ لەمـە و بـە ڕاشـکاوی دانـدەنێت بـەو ڕاستییەدا. وەك ئەرەگۆن دەڵـێ: لابـردن و تێکـدان و ئـاڵوگۆڕ پێکـردن، ئامـانجی خوازراوی سەرەکین کە ئەم گوتارە جەختیان لەسەر دەکاتـەوە[57]. ئەمـەیش ئـەو کارەیە کە گوتاری عەلمانی دەسـتی بـاڵای هەیـە تێیـدا و لـە ڕێگـای بـەکارهێنانی وشە و چەمکە ئیسلامییەکانەوە، بۆ پەردەپۆش کردنی ئـەو کـارە ڕووخێنەرانـەی کە خۆی داهێنانی تێدا کردووە.

ئەو بەڵگانە کە گوتاری ڕێچکەی پەندەکـە لـە تایبـەتکردنی هۆیەکەدایـە–واتـە مێژووییەتی– دەیڵێ، ئەمانەی خوارەوەن:

---

[56] مقدمة في أصول التفسير، إبن تيمية، ص٥٤ – ٦٠.

[57] القرآن من التفسير الموروث....، أركون، ص١٥.

أ- زانايان لەسەر ئەوە کۆدەنگن ئەگەر هاتوو تايبەت کراوێك هەبوو ئەوا نـابێ هۆيەکە لە حوکمە گشتييەکە دەربهێنرێ، چونکە بە هۆيەکی تايبەتەوە هاتووە.

وەڵام: ئەوەی کە دەيڵێن، لە راستيدا لەسەر گشتاندنێکی خـراپ بونيـادنراوە، چونکە لە شوێنی تايبەتی خۆيدا کاردەکرێـت بـە کـۆدەنگی، ئـەويش دەرهێنـانی وێنەی هۆيەکەيە لە وێنەی لەفزە گشتييەکە.

ب- ئەگەر پەندەکە لـە گشـتگيريی لەفزەکـەدا بووايـە، ئـەوا باسـکردنی هـۆی هاتنەخوارەوە بێسوود بوو [58].

وەڵام: جگە لە تايبەتمەنـديکردنی هۆيەکـە، هۆيـەکانی هاتنـەخوارەوە سـودی تری زۆريان هەيە. ئەمەو ئەو رێچکەيە چەند بەڵگەيەکی تريش دەهێنن کـە لێـرەدا بـواری ئـەوە نييـە لەسـەريان بوەسـتين، بـە گشـتيش لەسـەر ناڕاسـتيی ئـەقڵی بونيـادنراون و پـڕن لـە گشـتاندنی هەڵـە و دەرئەنجامـەکانيان پڕاوپـڕ نـين لەگـەڵ پێشەکييەکانيان. ئەوەی راستی بێت هيچ يەك لە زانايانی موسڵمان نەيانوتووە کە هەر ئايەتێك لە ئايەتەکانی ئەحکام، بە گشتگيرييەکی رەها گشتييە، چونکە تەنها بە يەك ئايەت حوکم نادرێت.

٣- بەڵگەی کۆی زانايان کە بە گشتگيريی لەفز قايلن:

ئێستايش ئايا کۆی زانايان بەڵگەيان چييە کە دەڵـێن پەندەکـە لـە گشـتگيريی لەفزەکەدايە نەك لە تايبەتمەنديی هۆيەکەدا، (ئەوانەی کـە پاشـتريش مێژووييـەتی عەلمانيەت ڕەتدەکەنەوە)؟

أ- بەڵگە هێنانەوەی پێشينانی ئـەم ئوممەتـە لـە زۆر ڕووداودا بـە گشـتگيريی ئـەو ئايەتـە قورئانييانـەی کـە بـەهۆی تايبەتـەوە هاتوونەتـە خـوارەوە، وەك فەرموودەی: (وَمِنَ النَّاسِ مَن يُعْجِبُكَ قَوْلُهُ فِي الْحَيَاةِ الدُّنْيَا) (البقرة: ٢٠٤). سـەعيدی مەقبەری وتی: دەرحەق بە کێ هاتووەتـە خـوارەوە؟ موحەممـەدی کـوڕی کـەعب

---

[58] مناهل العرفان، الزرقاني، ١/ ١٣١.

وتی: ئایەتەکە دەرحەق بە فلآنە پیاو هاتووەتە خوارەوە، دواتریش بۆ گشت خەڵکییە)[59]. (د. موحەممەد عەممارە) دەڵێ: (ئایا ئەو هەموو مانا و بەڵگە یەکلاکەرەوانەی دەقی قورئانی کە بە بەڵگەی گومانبڕ سەلمێنراون، لە کیس بدەین لە پێناو هۆیەکی هاتنەخوارەوەدا کە لە واقیعدا فەرموودەی تاکە و گومان لەسەر جێگیربوونی هەیە؟ ئەی ئەوە وردتر و تەواوتر و گشتگیرتر نییە کە ماناکان و بەڵگەی لەفزەکان کۆبکەینەوە لەگەڵ پەنابردنە بەر ڕاڤەکارییەکانی هۆیەکانی هاتنەخوارەوە لە چوارچێوەی ڕەوشی قورئاندا، لەبەر ڕۆشنایی هاوشێوە و هاوتایی و چوونیەکیی ئەو ئایەتانەی تردا کە لە هەمان بابەتدا هاتوونەتە خوارەوە؟)[60].

ب- ئەگەر مەبەستی خوای گەورە لەو دەقە گشتییانەدا کە بەهۆی تایبەتەوە هاتوونەتە خوارەوە، ئەوە بوایە کە تەرخان بکرێن لەسەر ئەو هۆیانەی کە لە پێناویاندا دابەزیون، ئەوا ئاماژەی بەوە دەداو ئاگاداریی لەبارەی ئەو تایبەتمەندێتییەوە دەدا، بەڵام کە دەقەکان بە گشتی هاتوون و هیچ بەڵگەیەکی تایبەتکردنیان تێدا نییە، ئەوا میتۆدی ڕاست و ساغ ئەوە دەخوازێت کە بە سەرپێی و بەبێ بەڵگە دەقەکان لە گشتگیری لانەدەین[61].

ج- بە تەنها لەفزی خوای گەورە بەڵگەیەکی سەلمێنەرە، ئیتر هەر پرسیار و هۆیەك بە دەوریدا بێت، نابێتە بەڵگە، کەواتە بەراوردێك نییە تا لەفزەکە تایبەت بکەین بە هۆوە. وەك فەرموودەی خوای گەورە: (يَسْأَلُونَكَ مَاذَا يُنفِقُونَ قُلْ مَا أَنفَقْتُم مِّنْ خَيْرٍ فَلِلْوَالِدَيْنِ وَالأَقْرَبِينَ وَالْيَتَامَى وَالْمَسَاكِينِ وَابْنِ السَّبِيلِ) (البقرة: ٢١٥). خوێندنەوەی ڕواڵەتی بۆ ئەم ئایەتە ئەوەیە کە پرسیار لە پێغەمبەر (ﷺ) کرا

[59] الإتقان في علوم القرآن، السيوطي، ١/ ٩٦.

[60] سقوط الغلو العلماني، د. عمارة، ص٢٤٩.

[61] مناهل العرفان، ١/ ١٢٨.

ئەوە ڕوون بكاتەوە كە ئەوان چی ببەخشن، وەڵامەكە بەو جۆرە هات ئەوە ڕوون بكاتەوە كە بەسەر كێدا بیبەخشن؟ ئەمەیش شێوازی خوای گەورەیە كە شارەزابوون بە بواری خەرجییەكانی بژێوی و خێركردن گرنگترە تا شارەزابوون بەوەی كە خەرج دەكرێت.

كەواتە لە دەقی قورئانیدا گشتگیریی رەسەنە نەك تایبەتكردن، تایبەتكردنیش بەپێی بەڵگە و هێمایەكی روون دەبێت كە ئیجتهادی لەسەر دەوەستێ و لە دووتوێییشیدا تێگەیشتن لە دەقەكە دەستەبەر دەبێت. دەرئەنجام گوتەی ئەو زانایانەی كە بە گشتگیریی لەفزەكە قایلن، بەهێزترە و تایبەتكردن ریزپەڕە.

## جێباسی دووەم:
## ئەو ئایەتە قورئانییانەی لەسەر زمانی خەڵكییەوە هاتوونەتە خوارەوە

**خواستی یەكەم:** بەمرۆییكردن هەنگاوێكە بۆ بەمێژووییكردن:

زانایانی قورئان بەشێكیان تەرخانكردووە بۆ قسەكردن لەسەر ئەو ئایەتە قورئانییانە كە لەسەر زمانی هەندێ لە هاوەڵان و كەسانی تریشەوە هاتوونەتە خوارەوە، وەك ئەو گوتانەی پێشەوا عومەر (ڕەزای خوای لێ بێت) كە سازن لەگەڵ قورئاندا، كاتێ بە پێغەمبەری (ﷺ) وت: (خۆزگایە جێگاكەی ئیبراهیممان بكردایە بە نوێژگا)، ئالەوێدا ئایەتی: (وَٱتَّخِذُواْ مِن مَّقَامِ إِبْرَاهِيمَ مُصَلًّى) (البقرة: ١٢٥) هاتەخوارەوە. هەروەها ئەو گوتەیەی تری كە بە پێغەمبەری (ﷺ) وت: (خۆزگایە فەرمانت بدایە بە خێزانەكانت حیجاب بپۆشن)، ئیتر ئایەتی (الحجاب) هاتەخوارەوە. كاتێكیش كە خێزانەكانی پێغەمبەری خوا (ﷺ) لەسەر پەرۆشبوونیان (الغیرة) لێی كۆبوونەوە، ئەوەی پێی فەرموون[٦٢] كە دەقاودەقی

---

[٦٢] البخاري، ٤٢١٣.

ئایـەتی: (عَسَـى رَبُّـهُ إِن طَلَّقَكُـنَّ أَن يُبْدِلَـهُ أَزْوَاجـاً خَيْـراً مِّـنكُنَّ) (التحـريم: ٥) بـوو. کاتێکیش کـە ئایـەتی (وَلَقَـدْ خَلَقْنَـا الْإِنسَـانَ مِـن سُـلَالَةٍ مِّـن طِـينٍ) (المؤمنـون: ١٢) هاتەخوارەوە، پێشەوا عومەر وتـی: فتبـارك الله أحسـن الخـالقين، ئـەم بڕگەیـە لـە ئایەتەکە وەك گوتەکەی (عومەر) هاتەخوارەوە [٦٣].

کـاتێ بوهتانچییەکان لـە رووداوی (إفـك)دا ئـەوەیان وت، کـە وتیـان سـەعدی کوڕی مەعاز (ڕەزای خـوای لـێ بێـت)، وتـی (سـبحانك هـذا بهتـان عظـيم)، ئایەتـە پیرۆزەکەیش هـەر وا هاتـەخوارەوە [٦٤]. چـەندین ڕیوایـەتی تریشـیان لەمبارەیـەوە هەیە، کـە مامۆسـتایان سـیوطی و زەرقـانی بـە جۆرێـك لـە جۆرەکـانی هۆیـەکانی هاتنەخوارەوە ناوزەدیان دەکەن، بەڵام ئەم ناحەزانە ئەم مەسەلەیە بە مەترسیدار دادەنێن و دەڵـێن: شـایانی ئەوەیـە توێژینـەوە و پرسـیاری لەسـەر بکرێـت، چـۆن دەبێت قورئان لەسەر شێوەی گوفتاری خەڵك هاتبێتە خوارەوە؟ [٦٥] واق وڕدەمێنێ لەکاتێکدا کە موسڵمانان بە پەرۆشەوە ئـەوە دەسـەلمێنن قورئـان سەرچـاوەیەکی خوایی هەیە، ئیتر چۆن دەبێت ئـەم ڕیوایەتانـە تۆمـار بکـەن [٦٦]؟ ئەمـەی ناحـەزان دەیڵێن دووڕوویيەکە و شێواندن نەبێت مەبەستێکی تریان نییە.

لەڕاسـتیدا ئـەم گوتـارە نـەیارە، دەیـەوێت بازبـدات بەسـەر جیـاوازیی نێـوان گوفتـاری خـوایی و گوفتـاری مرۆڤـدا، ئـەویش کاتێـك کـە جیـاوازیی نێوانیـان بـە جیاوازیی پلە دەداتە قەڵەم، نەك جیاوازیی جۆر. حەسەن حەنەفی دەڵێ: مـادامێ خەڵکیش بە وشە یەك لە دوای یەکەکانیان وەحییان هێناوەتـە خـوارەوە، کەواتـە گوفتاری مرۆڤ بریسکەکەیەو وەحیش ئاگر و بڵێسەکەیە [٦٧]. ئینجا گوتاری نـاوبراو

---

[٦٣] الإتقان، ١١١/١.

[٦٤] هەمان سەرچاوەی پێشوو ١١١/١.

[٦٥] لبنات، عبدالمجيد الشرفي، ص١٢٢.

[٦٦] الإسلام بين الرسالة والتأريخ، الشرفي، ص٣٦.

[٦٧] الوحي والواقع، حسن حنفي، ٢٤/١.

چەندین ڕیوایەت لەسەر ئەوە دەهێنێت کە قورئان لەسەر زمانی مرۆڤ هاتووەتە خوارەوە [٦٨]، تا بیسەلمێنێ کە: (واقیع لە پێشترە لە دەق)، چونکە (خەڵکی قسە دەکەن و خوایش دەبیستێت و دێت بە هاناوە، خەڵکی دەڵێن و خوایش وەڵام دەداتەوە، کەوابوو گوفتاری خوایی وەڵامدەرەوەی گوفتاری مرۆڤەکانە)[٦٩].

**خواستی دووەم:** مرۆڤگەرایی و مارکسیزم (مرۆڤ و واقیع) دوو بناغەی مێژوویيەتین:

ئەبوزەید دەڵێ: مرۆڤ و واقیع ئەو دوو توخمە سەرەکییەن کە لە پێناویاندا هەموو چەمك و پرنسیپە ئیسلامییەکان، بە تایبەتی زانستەکانی قورئان، بەکاردەخرێن. پلەبەندیی هاتنەخوارەوەی قورئان بە درێژایی بیست و سێ ساڵ، ئەوە دەگەیەنێت کە لە دووتوێی واقیع و کەلتووردا پێکهێنراوە [٧٠]. تیزینی دەڵێ: پلەبەندی، ڕێپێدانێکی نوێی قورئانە بۆ کردنەوەی دەرگاکان لەسەر پشت، لەبەردەم چوونەناویدا[٧١].

**خواستی سێیەم:** گفتوگۆ و ڕوونکردنەوە:

تێناگەین ئاخۆ کوێی ئەم مەسەلەیە جێگای سەرسوڕمانە؟ دەبێ چ زیانێك بگات بە سەرچاوەی خوایی بۆ قورئان کە هەندێ لە هاوەڵان هەندێ دەستەواژە لە دەمیان بێتەدەرەوە کە لە حەقیقەتدا قورئانی پیرۆزبن؟ ئەوە بەراوردکردنە بە دابەزینی ئایەتەکە نەك دامەزرێنەری بن. نە عومەر و نە غەیری عومەریش بنچینەی دەقی قورئانی نەبوون و نین، ئەو قسانە کۆمەڵێ دەستەواژە و بەشن لە چەند ئایەتێك، دەلالەت لە بەرزیی هەستی ڕەوانبێژیی مرۆڤەکەیە کە لەسەرەتاوە دەرکی بە کۆتاییەکەی کردووە. ئەمەیش بەڵگەی شکۆمەندیی ڕەوانێژیی قورئانە

[٦٨] هەمان سەرچاوەی پێشوو، ١/٢٤.

[٦٩] هەمان سەرچاوەی پێشوو، ١/ ٢٦.

[٧٠] مفهوم النص، أبو زيد، ص٢٩.

[٧١] النص القراني، تيزيني، ص٣٧٩.

و پـەیبردنیش بـە بەشـی ئایـەتێك بـەوە دانانرێـت کـە دژ بێـت لەگـەڵ هـەژمموونی بەرەنگاربوونەوە، چونکە بەرەنگاربوونـەوە بـە کـەمتر لـە سـورەتێك نـەبووە. بـۆ مەسـەلەی پلەبەنـدیش بڕوانـە کتێبـی (النبـأ العظـیم)ی مامۆسـتا دەڕاز، ئەوسـا دەبینی کە زانایان لەمبارەیەوە چەندین حیکمەتیان هێنـاوە. دواگوتـەیش ئەمەیـە کە ئەگەر بهاتایەو قورئان بە یەکجار و بۆ یەکجار بهاتایەتە خوارەوە، ئەوا بـە پلـە دەگۆڕا بۆ گوتەیەکی پیرۆزی دامرکاو و بۆ هزرێکی مردوو، ئەگەر لە پـێش روداو و قوربـانی و ئـازار و سـەرکەوتن و... تـا دوایـی بهاتایـە، چ حیکمـەتێکی تێـدا دەمایەوە؟

# جێباسی سێیەم:
# لەکارخستن (النسخ)

**خواستی یەکەم:** لەکارخستن و واقیع:

ئەمەیش پاساوێکی تری ئەو ناحەزانەیە بۆ گوتنی کاریگەریی رەهەندی مرۆیی لە وەحیی خواییدا:

لە راستیدا لەکارخستن بابەتێکی فـرە ڕەهەنـد و پـەلوپۆ بـڵاوە و بـە درێـژایی هزری ئیسلامی بە دەیان بەرگی لەسەر نووسراوە، بەڵام لای ئەم گوتـارە ناحـەزە هزر ڕەنگدانـەوەی ماددەیـە، دەقـیش ڕەنگدانـەوەی واقیعـە. ئـەم گوتـارە چـاوی خۆی لـە ئاسـتی چـەمکی لەکارخسـتندا دادەخـات، ئەمـەیش بـۆ ئەوەیـە تـا بـوار بکاتەوە بۆ دوو ئیش:

**یەکەم:** بۆ ئەوەی ئوممەت بەوە تۆمەتبار بکات کە بە حەز و ئـارەزووی خـۆی بەبێ بوونی هیچ دیسپلینێك، پرۆسەی لەکارخستن ئەنجام دەدات.

**دووەم:** کاتێـك لەکارخسـتن جیادەکرێتـەوە لـە سەرچـاوەکەی — کـە خـوای گەورەیـە —، ئـەوا گوتـاری عـەلمانی چـەمکەکە وەك دروشمێکـی ڕاگەیـەنراو بـۆ دەستەبەرکردنی ئەوەی کە خۆی لە دەقەکەی دەوێت، بەکاردەهێنێت.

کردەوە و ئیجتهادەکانی پێشەوا عومەر (ڕ.خ) لە پێنەدانی زەکات بە تازە موسڵمانەکان، کە بە دەقی قورئان جێگیر بووە، هەروەها وەستاندنی کارکردن بە سزای دزی لە ساڵی (الرمادة)دا[٧٢]، بەوە ڕاڤە دەکرێن کە هەڵوەشاندنەوەی دەقە، ئەمەیش بانگەشەیەکە بۆ ئێمە کە هەرکات واقیع ئەوەی بەسەردا سەپاندین، هەستین بە لەکارخستنی دەقەکان، چونکە (بەپێی گۆڕینی کاتەکان حوکمەکانیش دەگۆڕدرێن)[٧٣]. دەڵێن: دیاردەی لەکارخستن گەورەترین بەڵگەیە لەسەر جەدەلیەتی پەیوەندی لە نێوان وەحی و واقیعدا [٧٤].

لە راستیشدا وا نییە کە ئەوان دەڵێن، چونکە دیارترین نموونە بۆ پێکدادانی دەق لەگەڵ واقیعدا، ئەو یەکتاپەرستییەیە کە دەق بانگەشەی بۆ دەکات لە بەرانبەر ئەو بتپەرستییەوە کە زاڵبوو بەسەر واقیعدا. دیارترین نموونەیش بۆ هەژموونی دەق بەسەر واقیعدا، پێشەنگی کردنی و بردنی بەدوای خۆیدا بە هەڵگێڕانەوەی بارودۆخەکان لە بتپەرستیی و دەمارگیری و.... تا دوایی و سەرئەنجام چوونە ژێر گوێڕایەڵیی خوا و پێغەمبەری خواوە (ﷺ).

**خواستی دووەم:** لەکارخستن (النسخ) مەسەلەیکی ئارەزووبازی و میزاجییە:

ئەمەیش بۆ ئەوەیانە تا مرۆڤ کاریگەریی لەسەر وەحی زیاتر بێت. جا هەروەك ئاماژەی پێکرا، هیچ یەك لە موسڵمانان نکوڵی ناکات لە پەیوەندیی دەق بە واقیع یان بە مرۆڤەوە، بەڵام ئەوەی لەو پەیوەندییەدا خراپە، ئامادە نەبوونی ئیرادەی خوایەتییە، ئەویش بە جێگیرکردنی ئیرادەی واقیع یان ئیرادەی مرۆڤ لە جێگایدا بە چڕی. ئەویش کاتێکە کە لەکارخستن دەبێتە مەسەلەیەکی ئارەزووبازی و دەچێتە ژێر حوکمەکانی سیاسەت و بەرژەوەندییەکان و لۆژیکی هێز و لاوازی،

---

[٧٢] ئەو ساڵەیە کە موسڵمانان بە هۆی وشکەساڵییەوە تووشی نەبوونی و ناڕەحەتییەکی زۆر هاتن.

[٧٣] حروب دولة الرسول، القمني، ص٢١٥.

[٧٤] هەمان سەرچاوەی پێشوو، ل١٣١.

قومـەنی دەڵـێ: کاتێـك کـە موسـڵمانان لاواز و کـەم بـوون، ئایەتـە قورئانییـەکان باسیان لە ژیانی ئاشتی و پێکەوە ژیان دەکرد، وەك دەفەرموێ: (إِنَّا أَنزَلْنَا التَّوْرَاةَ فِيهَا هُدًى وَنُورٌ يَحْكُمُ بِهَا النَّبِيُّونَ الَّذِينَ أَسْلَمُواْ لِلَّذِينَ هَادُواْ وَالرَّبَّانِيُّونَ وَالأَحْبَارُ بِمَا اسْتُحْفِظُواْ مِن كِتَابِ اللّهِ وَكَانُواْ عَلَيْهِ شُهَدَاء فَلاَ تَخْشَوُاْ النَّاسَ وَاخْشَوْنِ وَلاَ تَشْتَرُواْ بِآيَاتِي ثَمَناً قَلِيلاً وَمَن لَّمْ يَحْكُم بِمَا أَنزَلَ اللّهُ فَأُوْلَـئِكَ هُمُ الْكَافِرُونَ) (المائدة: ٤٤)، بـەڵام لـە دوای جـەنگی بـەدر هاوسـەنگیی هێزەکـان سیاسـەتێکی نـوێی یەکلاکەرەوەیان هێنا، ئیتر ئایەتە قورئانییـەکان بـەمجۆرەیان لێهات: (وَمَن يَبْتَغِ غَيْرَ الإِسْلاَمِ دِيناً فَلَن يُقْبَلَ مِنْهُ وَهُوَ فِي الآخِرَةِ مِنَ الْخَاسِرِينَ) (آل عمران: ٨٥).

ئەمەیش سیاسەتێك بوو دەیخواست جولەکە بێنە ژێر باری سیاسەتێکی نوێ، یان کشانەوەیان لە مەدینە، یان ریشەکێشکردنی هێز و توانایان، چونکە خاوەنی پەڕاوێکی ئاسمانی بوون و بەهۆی نکوڵی کردنیـان لـە پێغەمبەرایـەتیی پێغەمبـەر (ﷺ)، دەبوونە مەترسی لەسەر دەوڵەتی ئیسلامی[٧٥].

توێـژەرە موسـڵمانەکان دەڵـێن: دەبوایـە قومـەنی بـەر لـەوە بیربکاتـەوە و خەملانـدن بکـات، بگەڕایەتـەوە بـۆ مێـژووی هاتنـەخوارەوەی ئـەو ئایەتانـە کـە دەیانهێنێتەوە بە بەڵگـە، بـۆ ئـەوەی بـە درۆکـەی ئـابڕووی نەچێت، چـونکە ئـەو ئایەتانە کە ئەو بـەوەیان دادەنـێ لـە حاڵـەتی لاوازییـدا هاتوونەتـە خـوارەوە، بـۆ خۆشدوانی جولەکە و گاورەکان و مەرامی کردن بووە، بۆ نموونە دەفـەرموێ: (إِنَّا أَنزَلْنَا التَّوْرَاةَ فِيهَا هُدًى وَنُورٌ يَحْكُمُ بِهَا النَّبِيُّونَ الَّذِينَ أَسْلَمُواْ لِلَّذِينَ هَادُواْ وَالرَّبَّانِيُّونَ وَالأَحْبَارُ بِمَا اسْتُحْفِظُواْ مِن كِتَابِ اللّهِ وَكَانُواْ عَلَيْهِ شُهَدَاء فَلاَ تَخْشَوُاْ النَّاسَ وَاخْشَوْنِ وَلاَ تَشْتَرُواْ بِآيَاتِي ثَمَناً قَلِيلاً وَمَن لَّمْ يَحْكُم بِمَا أَنزَلَ اللّهُ فَأُوْلَـئِكَ هُمُ الْكَافِرُونَ) (المائدة: ٤٤). ئەم ئایەتە و چەندانی تریش بەپێی قسـەی مامۆسـتا (جـلال الـدین المحلی)، لە دوای سورەتی (الفتح) هاتوونەتە خوارەوە, هەروەها بـەپێی تـەرتیبی

[٧٥] هەمان سەرچاوەی پێشوو، ل١٢٨.

(سیوطي) لەدوای ئەنفال هاتوونەتەخوارەوە [٧٦]، لەسەر گوتەی هەردووکیان ئەو ئایەتانەیش لەدوای جەنگی بەدر هاتوونەتە خوارەوە، موسڵمانان لە لوتکەی هێز و باڵادەستیدا بوون، جولەکەیش لە زەلیلی و بچووکی و تێکشکاندندا بوو.

**خواستی سێیەم:** بەدواداچوون و گفتوگۆکردن:

١ – پرۆسەی لەکارخستن لە ئیسلامدا ملکەچی ئیرادەی خوای گەورەیە، بەڵام لە گوتاری عەلمانیدا ئیرادە بۆ واقیع و ئەقڵە:

لەکارخستن لە ئیسلامدا بەدەستی خوای گەورەیە (مَا نَنسَخْ مِنْ آيَةٍ أَوْ نُنسِهَا نَأْتِ بِخَيْرٍ مِّنْهَا أَوْ مِثْلِهَا) (البقرة: ١٠٦) واتە ئێمە... مەبەست بە ئێمە خوای گەورەیە. لەلای پێشەوا غەزالی لەکارخستن (بریتییە لەو گوتارەی کە دەلالەت دەکات لەسەر هەڵگرتنی حوکمێکی جێگیر و مەرجیشە بەردەوام بێت تا گوتارێکی تری پێدەگات و هەڵیدەگرێ)[٧٧].

ئەم پێناسەیە و هی تریش ئەو تایبەتمەندییانەیان تێدایە کە دەردێنە پاڵ لەفز یان گوتار. مەبەستیش بە لەفز یان گوتار فەرموودەی خوای گەورە و سوننەتی پێغەمبەرەکەیەتی (د.خ). هەروەها ئاماژەدانە بە هەڵگرتنی حوکمەکە یان هێنانی بەڵگە و بە شەرعی وەسفکردنیانە، هەموو ئەمە ئەوەمان پێدەڵێن کە لەکارخستن بە ویست و فەرمانی خوای گەورەیە.

٢– میکانیزمەکانی ئیجتهاد و ئاسانکاری و فاکتەرەکانی میانەیی لە شەریعەتدا، بێ نیازمان دەکەن لە لەکارخستنی ئەقڵی:

حوکمە شەرعییەکانی ئیسلام بەپێی ریزبەندیی گرنگ و گرنگتر و لەپێش و لە پێشتر، لە یاسای بەرژەوەندییەکاندا کە لە قورئانی پیرۆزەوە وەرگیراون، لە هەناویاندا هەڵگری فاکتەری میانەیی و جوڵەن، واتە گۆڕینی حوکمەکان تەنها بە

---

[٧٦] الإتقان في علوم القرآن، السيوطي، ١/ ٨٢.

[٧٧] الاقتصاد، الغزالي، ص٩٩.

هۆكاری كات و واقیع و بەبێ بوونی بەڵگە لـە قورئـان و سـوننەتدا، نابێـت، بـەڵكو دەبێ لە ڕێگای دەستوورێكەوە و بە پێی دیسـپلینە شـەرعییەكان بێـت[78]. لێـرەدا یەك نموونـە دەهێـنین: خـوای گـەورە پێـنج فـەرزەی نوێـژی بـە ڕوكـن و ژمـارەی ڕەكاتەكانیانەوە لە كاتی دیاریكراودا فەرز كردووە، بەڵام لە هەمانكاتدا هـەركاتێك پێویست بوو ئەوا ڕێگای سوككردنی حوكمەكانی داناوە، ڕێبوار بۆی هەیـە نوێـژی چوار ڕەكـاتی كـورت بكاتـەوە بـۆ دوو ڕەكـات، بۆیشـی هەیـە كۆیشـیان بكاتـەوە لەكاتی نوێژی یەكەمدا یان دووەمدا، بۆ ئەوەی كاتی زۆرتری بە دەستەوە بمێنێ.

بـە كـورتی، حوكمـە شـەرعییەكانی ئیسـلام دوو جـۆرن: نـەگۆڕ و گـۆڕدراو، نەگۆڕەكان بە گۆڕانی ڕوداو و كات و شوێنەكان حوكمیـان نـاگۆڕدرێ، بـۆ نموونـە مـیرات. بـەڵام گـۆڕدراو ئـەوا بەسـتراوەتەوە بـە هۆیـەك یـان بارێكـەوە، یـان بـە بەڵگەیەكی ڕوونەوە كـە زەیـن وریـا بكاتـەوە بـە زەروورەتـی گـۆڕان و سـوڕانەوە لەگەڵ هۆیەكەدا، ئا لێرەیشدا كاری موجتەهیدەكان دەردەكەوێت.

بەڵام ئەم چاولێكەرانە كە لای ئەوان شتی نەگۆڕ بوونی نییە، بەمە ڕازی نابن و دەڵـێن: تەنانـەت باوەڕەكـانیش (كۆمەڵـە بۆچـوونێكن وابەسـتەن بـە ئاسـتی هۆشیارییەوە و بە گەشەكردنی ئاستی مەعریفـەوە، لـە هـەموو سـەردەمێكدا)[79]. ئەمـەیش بـە زۆرەملـێ سـڕینەوەی باوەڕبوونـە بـە وەحـی و سـەپاندنی هزرێكـی ماددیی ڕووت لە جێگایدا.

[78] الاسلام والعصر، د. البوطی، ص١٩٥.

[79] النص، السلطة، أبو زید، ص١٣٤.

## جێباسی چوارەم:
## مەککی و مەدەنی

**پێناسە: قورئانی مەککی:**

واتە ئەو سورەت و ئایەتە قورئانییانەی کە لە مەککە و لـە سـەردەمی قۆنـاغی مەککیـدا هاتوونەتـە خـوارەوە. قورئـانی مـەدەنی: واتـە ئـەو سـورەت و ئایەتـە قورئانییانە کە لە مەدینە و لە سەردەمی قۆناغی مەدینەدا هاتوونەتە خوارەوە.

**خواستی یەکەم:** قورئان خستنە ژێر کاریگەریی ژینگە و واقیع، (بۆ چەسپاندنی مێژوویەتییە):

هەموو ئەو قەڵەمە نەیارانە بە ئیسلام، هەر لـە سـەردەمی تـەها حوسـەینەوە، هەموو هەر ئەوە دەڵێنەوە کە خۆرهەڵاتناسەکانی وەك (جوڵد زیهر) و (بلا شیر) و کەسانی تر، بە شێوەیەکی بێ ئابڕوویی لەبارەی گوایا مێژوویەتی بوونی قورئانی مەککی و مەدەنیەوە وتویانە.

ئەو مەبەستە سەرەکییەیش کە عەلمانیـەت لـە ڕێگـای مـەککی و مەدەنییـەوە دەیـەوێت پێـی بگـات، ئەوەیـە بیسـەلمێنێ کـە قورئـانی پـیرۆز (بەرهـەمێکی کەلتوورییە) [80]، دەکەوێتە ژێر کاریگەریی ژینگە و بـە گەشـەکردنی ژینگـە ئـەویش گەشە دەکات. بۆ نموونە جۆڵد زیهر دەڵێ: کـاتێ موسـڵمانان لـە حاڵـەتی لاوازیـدا بوون، قورئانی مـەککی نـەرم و ئاشـتیخواز و بـە بەزەییـە و ئـازادیی بیروڕبـاوەڕی پەسەند کردووە، بەڵام قورئانی مەدەنی توندوتیژ و بێبەزەییە، چونکە موسڵمانان بەهێز بوون و کەوتنە حەزی رزگارکردنی جیهانەوە [81]. دواتر وەڵامـی ئـەم گوتانـە دەدرێتەوە.

**خواستی دووەم:** بەش بەش کردن و پارچە پارچە کردنی ئیسلام و قورئان:

---

[80] مفهوم النص، أبو زيد، ص٢٧.

[81] العقيدة والشريعة، جولد زيهر، ص١٣٤.

بەڕای ئەو ناحەزانە ئەمە هەنگاوێکی گرنگە لەسەر ڕێگای بەمێژوویی کردن، یەکێکیان مەحموود موحەممەد تەهای سودانییە، کە رابەرایەتیی ئەم کێشەیەی کردووەتە جیاوازی خستن لە نێوان پەیامی مەککی و مەدەنیدا، بیرۆکەکەی لەسەر ئەوە وەستاوە کە دەڵێ: قورئانی مەککی پەیامێکی جیهانییەو بۆ هەموو مرۆڤایەتی هاتووە، چونکە ئەو ئایەتانەی تێدایە کە بنەمایەکی چاکن بۆ هەموو کات و شوێنێك [٨٢]، هەر ئەم قۆناغەیشە کە ناودەبرێت بە ئیسلام[٨٣]. قۆناغی مەدەنیش بە قورئانەکەیشیەوە، تایبەت بوو بە سەدەی حەوتەمی زایینییەوە، چونکە لەسەر ئایەتی بەشەکان (لق) بەرپابووە [٨٤] و بۆ سەدەی بیستەم ناگونجێت، ئەوەی کە بۆ سەدەی بیستەم شیاوە قورئانی مەککییە [٨٥]. دواندن لەگەڵ ئەو ئوممەتە موسڵمانەدا دەکات کە هێشتا دەرنەکەوتووە، ئەوانەیش کە دەرکەوتن و سەرکەوتن ئیمانداران بوون نەك موسڵمانان [٨٦]، موحەممەدیش (ﷺ) تاکە موسڵمان بووە لەنێو هاوەڵانیدا، چونکە هاوەڵەکانی ئیمانداربوون و موسڵمان نەبوون [٨٧].

ئەگەر بەم پێیە بێت، ئەوا قورئان هەمووی نەهاتووەتە ڕوو و دەرنەکەوتووە (ئیسلامیش لەو سەردەمەدا هەمووی تەواو نەبووە، بەڵکو ئەوەی کە دەرکەوتووە هەر ئەوە بووە کە گونجاو بووە لەگەڵ کات و توانای خەڵکیدا، هەروەها قورئانیش هەمووی دەرنەکەوتووە و کامڵ نەبووە، هەروەها ئیسلامیش).[٨٨]

---

[٨٢] الرسالة الثانية في الاسلام، محمود محمد طه، ص١٠.

[٨٣] هەمان سەرچاوەی پێشوو، ل١٠٩.

[٨٤] هەمان سەرچاوەی پێشوو، لاپەڕەکانی ١٠٩، ١١٠، ١١١.

[٨٥] هەمان سەرچاوەی پێشوو، لاپەڕەکانی ١٠٩، ١١٠، ١١١.

[٨٦] الرسالة الثانية في الإسلام، محمود محمد طه، ص١٠٨.

[٨٧] هەمان سەرچاوەی پێشوو، ل١٣٨، ١٦١.

[٨٨] هەمان سەرچاوەی پێشوو، ل ١٣٨، ١٦١.

هــەروەها دەڵــێ: تێکۆشــان (جهــاد) و فــرە ژنــی و تــەڵاق، ڕەســەن نــین، بــە لەبەرچاوگرتنی باری ئەم چەرخەیش دەبێ ڕێگرییان لێبکرێت[89]، ڕووتی ڕەسەنە، باڵاپۆشی لە ئیسلامدا خوازراو نییە[90].

بەم پێیە مەحموود موحەممەد تەها هاتووە قورئانی مەدەنیی لەکارخستووە و بە پەیامی یەکەمی ئیسلام ناوی بردووە، پـەیامێکی دووەمـی داهێنـاوە و لێیـەوە چووە بە حەزی خۆی حەڵاڵ دەکات و حەرام دەکـات، تـا دەقـاودەق بێـت لەگـەڵ گوتەکانی مارکس و داروین و فرۆیددا. ئێستایش بە کورتی دێینە سـەر مشـتومڕ و ڕەخنەگرتن لەو بۆچوونانەی کە لـە پێشـەوە لەسـەر قورئـانی مـەککی و مـەدەنی هاتوون.

**خواستی سێیەم:** مشتومڕ و ڕەخنەگرتن:

ئەو گوتەیـە کـەگوایا قورئـانی مـەککی وەك کاریگەرییـەك لـە کاریگەرییـەکانی ژینگە لەسەری، بە نەرمونیانی ناوزەد دەکرێت، مەدەنیش بە زبر و تیـژی نـاوزەد دەکرێت، بەوە ڕەتدەدرێتەوە کـە شـێوازی نـەرمونیانی یـان شـێوازی توندوتیـژی ناکەوێتە ژێر کاریگەریی ژینگە و بارودۆخەوە، بەڵکو شێوازەکە بەپێی حاڵی قسـە لەگەڵ کراوەکـە دێـت. حـاڵی قسـە لەگـەڵ کـراو جـاری وا هەیـە ئـەوە دەخوازێـت جۆرێك لە زبریی لەگەڵدا بە خـەرج بـدرێت، جـاری وایـش هەیـە جۆرێـك لـە نـەرمی دەخوازێ. ئەوە قورئانی پیرۆزە کە مـژدە و هەڕەشـە و دڵخۆشـکردن و ترسـاندن پێکەوە گرێ دەدات، ئیتر لە مەککەدا بێت یان لە مەدینەدا. بۆ نموونە بڕوانە ئـەم فەرموودەیەی خوای گەورە: (قُلْ يَا عِبَادِيَ الَّذِينَ أَسْرَفُوا عَلَى أَنفُسِهِمْ لَا تَقْنَطُوا مِن رَّحْمَةِ اللَّهِ إِنَّ اللَّهَ يَغْفِرُ الذُّنُوبَ جَمِيعاً إِنَّهُ هُوَ الْغَفُورُ الرَّحِيمُ * وَأَنِيبُوا إِلَى رَبِّكُمْ وَأَسْلِمُوا لَهُ مِن قَبْلِ أَن يَأْتِيَكُمُ الْعَذَابُ ثُمَّ لَا تُنصَرُونَ) (الزمر: ٥٣ـ ٥٤).

---

[89] هەمان سەرچاوەی پێشوو، ل١٢٧.

[90] هەمان سەرچاوەی پێشوو، ل١٣١.

ئەمانە ئایەتی مەدەنین کە نەرمی و زبری لە خۆیاندا کۆدەکەنەوە، لە بەشە مەککەییەکەیشدا هەروا دەبینین کە چەندین ئایەت هەن نەرمی و زبری و هەڕەشە لە خۆیاندا کۆدەکەنەوە. وەك دەفەرموێ: (هَذَا هُدًى وَالَّذِينَ كَفَرُوا بِآيَاتِ رَبِّهِمْ لَهُمْ عَذَابٌ مِّن رِّجْزٍ أَلِيمٌ) (الجاثية: ١١).

مامۆستا زەرقانی دەڵێ: (قورئانی پیرۆز بە هەردوو بەشەکەی مەککی و مەدەنییەوە، زبری و ڕەقییان تێدایە، چونکە لە زەروورەتەکانی پەروەردەی کامڵ لە چاککردنی تاك و گەلدا، سیاسەتی ئوممەتان و وڵاتان ئەوە دەخوازێت کە چاکەخواز لە یاسای ڕێنمایی کردنیدا شێوازی دڵخۆشکردن و ترساندن و مژدە و هەڕەشە و زبری و نەرمی، تێکەڵ بە یەك بکات)[٩١].

ئەوەیش دەوترێ کە گوایا قورئانی مەککی خاڵییە لە بەڵگە و سەلماندن، بە پێچەوانەی مەدەنییەوە کە بە بەڵگەی هێمن مشتومڕ دەکات لەگەڵ نەیارانیدا و بەڵگەی سەنگینیان بۆ دەهێنێتەوە، وەك: (لَوْ كَانَ فِيهِمَا آلِهَةٌ إِلَّا اللَّهُ لَفَسَدَتَا فَسُبْحَانَ اللَّهِ رَبِّ الْعَرْشِ عَمَّا يَصِفُونَ) (الأنبياء: ٢٢) ئەم ئایەتە ئەو گوتەیە پوچەڵ دەکاتەوە، چونکە ئەو ئایەتەی لێرەدا هاتووە مەدەنی نییە و بە کۆدەنگیی زانایان ئایەتێکی مەککییە.

چەندین بەڵگەی درەوشاوەی تر هەیە کە بەشە مەککییەکەی قورئانی پیرۆز پڕە لەم ئایەتە پیرۆزانە، کە سەرڕێژن بە بەڵگەی ئەقڵی و هەستپێکراو و بینراو[٩٢].

ئەو چاولێکەرانە زانستەکانی قورئان لە بەکارهێنانێکی ئایدیۆلۆژییانەدا بەکاردەهێنن، لەم چەمکە قورئانییانەوە هەڵێنجان دەکەن و جەخت لەسەر جەدەلیەتی دەق لەگەڵ واقیع و مرۆڤدا دەکەنەوە، هەڵەکەیشیان لێرەوەیە کە تیزینی خۆی ئیقراری پێدەکات و دەڵێ: نابێ پیرۆزیی قورئان ببێتە بەربەست

---

[٩١] مناهل العرفان، الزرقاني، ١/٢٠٧.

[٩٢] مناهل العرفان، الزرقاني ١/٢٣٧.

لەبـەردەم ئـەو هەولآنـەدا[93]. یـان وەك ئـەرەگۆن دەڵـێ: پیرۆزیـی دەبێتـە هـۆی پەردەپۆشکردنی مێژوویيەتی، لە ڕێگای بەستنەوەیەوە بە باڵابوونی و بەرزییەوە، کە مێژووی زەوی تێدەپەڕێنێت[94].

دەبێ ئێمە ئەوە بزانین کە بەگەڕخستن و بەکارهێنانی زانستەکانی قورئان، بـۆ دووپاتکردنەوە و چەسپاندنی واقیعیبوونی قورئان، کارێکی خراپ نییە، بەڵام ئـەو واقیعیبوونە کـە گوتـاری عـەلمانی دەیـەوێت، واقیعیبـوونی عەلمانیەتـە، هـەروەك حەنەفی دەڵێ: (چونکە خوا وتی و پێغەمبەر وتی نابنە بەڵگە)[95]. ئا لێرەوەیە کـە پێکدادان لە نێوان واقیعیبوونی قورئان و واقیعیبـوونی عەلمانیەتـدا دەرگیرییـەکی گەرم و سەختە و لە لوتکەدایە، چونکە هەریەکەیان دەیـەوێت هەژموونـدار بێـت و رابەرایەتی و فەرمانڕەوایی لە دەستی خۆیدا بێت، دیاریشـە کـە ئـەم گوتـارە هـەر لەسەرەتاوە شەڕێکی دۆڕاو دەکات. دواجاریش دەبێ بزانین کە قورئانی پـیرۆز بـە هەردوو بەشی مەککی و مەدەنییەوە، چوون یەکە و ناچێتە ژێر کاریگـەریی ژینگـە یان بارودۆخەوە، لە سەرووی هەموو ئەمانەیشەوە، لە خـوای گـەورەی بـە توانـا و داناوە هاتووەتە خوارەوە.

---

[93] النص القراني، طيب تيزيني، ص٢٠٣.

[94] القران من التفسير..، اركون، ص٢١.

[95] التراث والتجديد، حنفي، ص١٣٣.

## بەشی سێیەم:
## کاردانەوەکانی مێژوویەتی لەسەر پەیامی قورئان

### جێباسی یەکەم:
### نەهێشتنی نەگۆڕەکان، ڕەتکردنەوەی پیرۆز و لەکەدارکردنی قورئان

### سەرەتا:

لەم جێباسەدا باس لەو کاردنەوانە دەکرێت کە بنەما حەقیقییەکانی مێژوویەتی و خوێندنەوەی نووسەرە عەلمانییەکان بە گشتی، بۆ قورئانی پیرۆز، بەرهەمیان هێناوە. زەقترینی ئەو کاردانەوانەش ئەوەیە کە گوایا قورئانی پیرۆز ناوەرۆکێکی نەماوە کە شیاوبێت پراکتیزە بکرێ و پابەندبوون هەبێ پێیەوە، بەڵکو هەر مرۆڤێك مافی ئەوەی هەیە بەو جۆرە لێی تێبگات کە خۆی دەیەوێت، بەڵام مەرجەکە ئەوەیە کە نابێ وەها لێی تێبگا کە پێشینان و هاوەڵان لێی تێگەیشتوون، چونکە لەو حاڵەتەدا بە کۆنەپەرست و تاریکپەرست وەسف دەکرێت.

بۆی هەیە وا لێی تێبگات کە مارکسیزم ئیسلامە، مارکسیش باشترین کەسێکە کە ئیسلامی بەرجەستە کردووە[٩٦]، داروین باشترین کەسێکە کە لە قورئان گەیشتووە[٩٧]، فرۆیدیش پێغەمبەری نەستە (لا شعور)[٩٨]، دی سۆسیر و غادامیر و هایدگەر و دورەیدا، دەروازەی سەرەکین بۆ راڤەکردنی قورئان[٩٩] بەڵام شافیعی

---

[٩٦] الرسالة الثانية من الاسلام، محمود طه، ص١٤٢.

[٩٧] الكتاب والقران، محمد شحرور، ص١٥٦.

[٩٨] وجهة نظر، زكي نجيب محمود، ص١١٢.

[٩٩] إشكاليات القراءة، أبو زيد، ص٤٩.

کەسێکی خەڵەتێنەر بووە [100]، غەزالی دووڕوو بووە [101]، (طبري) کەسێکی چاولێکەر بووە، ئەمانەیش ئەرسدۆکسی بوون و لەنێو ڕەوتی ئیسلامیی دەستەڵاتداردا بوون [102]، ئەو ناحەزانە دەڵێن: مادامێ وەهابوون، ئەوا تێگەیشتن لە نەگۆڕ بۆ قورئان و باوەڕ و سروت و پەرستشەکانی، ئەوە نییە کە ئەوانە چەسپاندویانە، بەڵکو دەبێ لەبەر ڕۆشنایی دەستکەوتە زانستییەکانی سەردەمدا چاو بخشێنرێتەوە پێیاندا، ئەمەیش دەستەبەر نابێت هەتا نەگۆڕەکان نەترازێن و لانەبرێن و پیرۆز بەرتەسك نەکرێتەوە و خوایی نەکرێ بە مرۆیی و یۆتۆپیایی نەبێتە مارکسی و باڵادەست نەخرێتە قاڵبی مێژووەوە و ڕەها نەبێتە ڕێژەیی، ئەمەیش دەستکاریکردنی قورئان دەگرێتەوە کە ئەرەگۆن لەسەر زاری: هێنری ماسیە و سۆردویل و جاك بیرك و لۆی غادریە و جۆڵدزیهر و مۆنتغەمری وات و بلاشیرەوە وەریگرتووە، دواتریش هەریەك لە تەیب تیزینی و ئەبوزەید و پێشتریش تەها حوسەین و موستەفا مەندور و سەیید قومەنی و سەعید عەشماوی و صادق نەیهوم و عەبولمەجید شەرەفی و موحەممەد شەحرور و حەسەن حەنەفی و ڕەشید خەییون و فەتحی قاسیمی و مەحموود تەها و حاج حەمەد و چەندین قوتابیی تری بچووك، کە لە باوەشی خۆرهەڵاتناساندا پەروەردە کراون، لە ئەرەگۆن و لە خۆرهەڵاتناسانەوە وەریانگرتووە و کە بە زاراوەی ئیسلامی بۆ ماوەیەك مەرامی خۆیان پەردەپۆش دەکەن.

**خواستی یەکەم:** نەهێشتنی نەگۆڕەکان:

لە گوتاری ناحەزاندا، مەسەلە نەگۆڕ و سەلمێنراوەکان (یقينيات) جێگایان نابێتەوە، لە دیدی ئەوانەوە بۆ دەستەبەرکردنی پێشکەوتن و ڕێنیسانس، دەبێ

[100] تأريخية الفكر، أركون، ص٢٩٧.

[101] مفهوم النص، أبو زيد، ص٣٠١.

[102] وەك ئەرەگۆن و تەیب تەیزینی لە زۆربەی کتێبەکانیاندا دەیلێن.

هەموو قەناعەتەکان لەق بىن و باوەڕەکان بترازێنرێن[١٠٣]. ئەوەی کە بە هێڵی سوور ناسـراوە، بـبڕدرێ و پیرۆزییـەکان لەکـەدار بکـرێن و یـاخیبوون لەسـەر چـاودێریی کۆمەڵایـەتی بـەرپابێ[١٠٤]، دەبـێ هـەر بیرمەنـدێکی پێشـکەوتووخواز وەك ئـەو بیرمەندە ئازادانە بێ کە هەستان بە ڕەتکردنەوەی ئایین، لەگەڵ ئەوەیشدا هەر لە ئـایین دەرنەچـوون، بـەڵکو لـەو تێگەیشـتنە بەرتەسـکە زۆرەملـێ و رواڵـەتی و سادەیەی ئیسلام دەرچوون و بەس[١٠٥]. ئیتر لێرەوە هەریەك لەو قەڵەمە نەیارانـە و هەریەکـەیان بـە شـێوازی خـۆی دەم لـە نـەگۆڕەکان دەکـوتێ. مەبەستیشـیان ڕەتکردنەوەی سەراپای ئیسلامە، گوایا ئیسلام کـە نـەگۆڕە، بەربەسـتە لـە نێـوان هزر و داهێناندا.

ئێسـتایش پرسـیارێك دێتـەڕوو: ئایـا پێویسـت دەکـات ئێمـە ئـەم گاڵتەوگەپـە بخەینە بەر مشتومڕ؟

وەڵام: ئەگـەر گاڵتەجاڕییەکـە مـاڵ و موڵـك و سـامانی خـەڵکی بگرێتـەوە و دەستدرێژی بێت لەسـەر گیـان و ناموسـیان، ئـەوا پێویسـتی بـە سـزای سـەخت و بەرپەرچـدەرەوە هەیـە، ئـەی ئەگـەر ئـەو گاڵتەوگەپـە ئـەقڵیان بگرێتـەوە و دەسـتدرێژی بێـت بـۆ سـەر بـاوەڕ و پیرۆزییـەکانیان، ئـەوا دەبـێ سـزاکە بگاتـە ئەوپەڕی.

**خواستی دووەم:** ڕەتکردنەوەی پیرۆز:

ئەو قەڵەمە چاولێکەرانە دەڵێن: یەکەمین کاری پیرۆز یان قەدەغەکراو، ئەوەیە ئەقڵ گەمارۆ دەدات[١٠٦].

[١٠٣] نقد النص، علي حرب، ص٧٢.

[١٠٤] خصائص التعامل مع التراث، رمضان رمضان، ص١٩.

[١٠٥] إشكاليات القراءة، خالد السعاني، ص٤٧.

[١٠٦] في اليسار الإسلامي، حسن حنفي، ص٣٤ .

دووەمین کـاری ئەوەیـە کـە دەمـارگیری و دۆگمـایی بەرهەمـدێنێت[107]. کەواتـە ئەوەی کە دەخوازرێـت چـییە؟ ئەوەیـە کـە ئـەم گوتـارە خـەو بـەو جـەماوەرەوە دەبینێ کە وەك ئەرەگۆن دەڵێ: ئامادەباشە بۆ وەرگرتنی ئـەو توێژینەوانـەی کـە زیاتر کودەتاچـین و هەڵوەشـێنەرەوەن بـۆ هـەموو بەڵگـە مانادارەکـان و بـاوەڕ و پرەنسیپە حاشاهەڵنەگرە چەسپاوەکان[108].

لە هـەنگاوی یەکەمیـدا دەیـەوێت پـیرۆزی نـەهێڵێ و لـە غەیبـەوە بیگـۆڕێ بـۆ مـاددە، چـونکە ئـەرەگۆن دەڵـی: ئەگـەر ئێمـە وا بڕوانینـە قورئـان کـە دەقێکـی ئـاییینی باڵایـە و بـەردەوامبین لەسـەر ئـەو تێڕوانینـە، ئـەوا ئـەوکات نـاتوانین دووربکەوینـەوە لـە گرفتـی بیرکردنـەوەی زانسـتی خوداناسـی و توێژینـەوەی خوداناسـی[109]. ئەمـەیش بـەوە دەبێـت وەهـا نەڕوانینـە قورئـان کـە گوفتارێکـە و لەسەرەوە هاتووە، بەڵکو ڕووداوێکی واقیعە و دەقـاودەق وەك ڕووداوەکـانی تـری فیزیك و بایۆلۆژیایە[110].

با وەڵامی ئەوانە هەر ئەمە بێت کە د. عەبدولوەهاب ئەلمەسیری دەڵێ: (ئێمـە نـاتوانین رزگارمـان ببێـت لـە پـیرۆز (چـونکە گـەڕان بـەدوای پـیرۆزدا شـتێکی سەرەکییە بۆ مرۆڤ، وا دەردەکەوێ کە مرۆڤ ناتوانێ ڕووبەڕووی جیهانێك ببێتـەوە کە لە نەگۆڕێکی تەواو و بێلایەنییەکی تەواودا بێ، نە سەنتەری هەیـە و نـە مانـا و نە نهێنیـی تێدایـە، لەبەرئـەوە بـەردەوام لـە گەڕاندایـە بـەدوای سـەنتەر و مانـادا، بەردەوام هەوڵدەدات پیرۆزی بگێڕێتەوە بۆ جیهانەکەی، ئەمەیش ئەوە دەگەیـەنێ کە مرۆڤ مرۆڤێکی سروشتیی ماددیی رووت نییە، بە تەنها بریتـی بێـت لـە کۆمەڵـە

[107] ملاك الحقيقة المطلقة، مراد وهبة، ص٣٥ .

[108] قضايا في نقد العقل الديني، أركون، ص٢٠ .

[109] الاسلام والتأريخ والحداثة، أركون، ص٢٥.

[110] تأريخية الفكر، أركون، ص٢٨٤ .

توخمێکی بایۆلۆژی و بەس، بەڵکو لە ناخیدا هەڵگری کۆمەڵێ تایبەتمەندیی ترە کە جیای دەکەنەوە لە سروشت/ مادده)[111].

**خواستی سێیەم:** ڕەخنەگرتن لە قورئان:

ئایا ڕەخنە لە قورئان دەگیرێ؟ ئەرەگۆن و عەلی حەرب دەڵێن: لە ئێستادا ئەو پرسیارە تۆقێنەرە[112]، بەڵام قورئانی پیرۆز وەڵامی ئەم پرسیارە دەداتەوە و داوا لە خوێنەر دەکات تێڕامانی هەبێ لێی (وَلَوْ كَانَ مِنْ عِندِ غَيْرِ اللّهِ لَوَجَدُواْ فِيهِ اخْتِلاَفاً كَثِيراً) (النساء: ٨٢)، قورئانی پیرۆز تەواوی ئەو ڕەخنانەی باسکردووە کە ئاڕاستەی کراون، بێ ئەوەی لە هیچیان بترسێ، هەریەك لە زانایانی تەفسیر (رازی و زەمەخشەری و باقلانی) دیارترین بەڵگەن لەسەر ئەم قسانەی پێشەوە و دەیانخەنە بەرچاو، ئایا ئەمە میتۆدی ڕەخنەگرتن نییە؟ جا مادامێ موسڵمان موسڵمانە و باوەڕی بە قورئانی خوای گەورە هەیە کە دەفەرموێ: (لَا يَأْتِيهِ الْبَاطِلُ مِن بَيْنِ يَدَيْهِ وَلَا مِنْ خَلْفِهِ تَنزِيلٌ مِّنْ حَكِيمٍ حَمِيدٍ) (فصلت: ٤٢) ئەوا لە چوونە ناوی ئەم پرسیارانە ناترسێ.

بەڵام گرفتەکە لەوەدایە کە گوتاری عەلمانی دەڵێ دەبێ ڕەخنەگرتن لەسەر ڕووخاندن و گومان دروستکردن و پوچەڵکردنەوە و هەڵوەشاندنەوە دابمەزرێت، جیاوازییەکە هەر ئەوەیە کە ئەم ناحەزانە کاتێ کە رەخنە دەگرن مەبەستیان گەیشتن بە حەقیقەت نییە، بەڵکو بۆ ئەوەیە تا قورئانی پیرۆزی پێ لەکەدار بکەن و بیروباوەڕەکەیان جێگای بگرێتەوە. عەلی حەرب دەڵێ: (کاری من تەرخانکراوە بۆ ئەوە کە قورئان بخرێتە ژێر رکێفی مەحەکی رەخنەگرتنی مێژوویی

---

[111] موسوعة اليهودية والصهيونية، د. عبدالوهاب المسيري، ١/ ١٩٥.

[112] الفكر الاسلامي...، أركون، ص٥١.

بەراوردکارەوە[113]. ئـەرەگۆن دەڵـێ: ئـەم رەخنەگرتنـە پیرۆزییـەکانی قورئـان کـە ئەقڵی لاهوتی بونیادی ناون، لەق دەکات[114].

لێـرەوە دێـن بـە هـەوڵێکی نەزۆکانـە دەکەونـە توانـەوەی نـاوازەیی قورئـان و توانەوەی چەمکی ئیعجاز، ئەمەیش شتێکی مەحاڵە و هەرگیز بۆیان نایەتەدی.

**خواستی چوارەم:** بەدواداچوون و ڕەخنە:

ئایا قەت نەزانی بووەتە بەڵگە؟

ئەم نووسەرە ناحەزانە خۆیان لەوە لادەدەن کە نەزانینی شتێك نابێتە بەڵگـە، یان وەك زانای خواناس (ڕازی) دەڵێ، مەرج نییە نەبوونی بەڵگە نـەبوونی شـتەکە بێت [115]. لەبەرئەوە گوتاری عەلمانی وا گومـان دەبـات موسـڵمانان کـە لـە هەنـدێ باس بێدەنگ بوون گوایا گرفت دروسـتدەکەن، بۆیـە هـاتوون دایانپۆشـیون تـا بـە تێپـەڕبوونی کـات بپوکێنـەوە. چـونکە ئـەو چـیرۆکە هەوالانـە هەنـدێکیان لـەنێو کـۆنترینی کتێبـەکانی فـەرموودەدا، وەك بوخـاری و موسـلیم و (موطـأ)ی ئیمـام مالیکدا، هاتوون، بەڵام ڕاڤەکارانی فـەرموودە بـە تێروتەسـەلی ڕاڤـەیان کـردوون و باسی بابەتەکەیان کردووە و لاواز و ڕاستەکانیان لەیەك جیاکردووەتەوە. دەبوایـە هەریەك لە تیزینی و شەرەفی و هاوشێوەکانیان، کەمێ خۆیان مانـدوو بکردایـە تـا بزانن ئیبن حەجەر و قازی عەییاض و پێشەوا نەوەوی و چـەندانی تـریش، چـییان نووسـیوە، بـەڵام ئـەم ناحەزانـە ئەمـە دروشمیانـە: هەرکـەس لـە گـەڵمان نـەبێ کەسێکی دۆگمایە! ئەگەرنا مانای بەچی ئەمانە لەولاوە دێن چی ئەفسانە هەن کە مێژوونووسان دەیانگێڕنەوە، وەك (غرانیق) و... تـا دوایـی، کتێبـە عەلمانییـەکان دەیانگوێزنەوە و بە راسـت و دروسـتیان دەزانـن، لای ئـەوان موسـڵمانانیش کـاتێ

---

[113] الممنوع والممتنع، علي حرب، ص١١٩.

[114] نافذة على الاسلام، أركون، ص٦٣.

[115] التفسير الكبير، الرازي، ج٤، الجزء ٨، ص٨٦.

دەبنــە کەســانی ئــەقڵانی کــە لــە بەرانبــەر تانــەی گــومڕا و بێباوەڕەکــان بــۆ لەکەدارکردنی قورئان، سنگفراوان بن، بـەڵام عەلمانییـەکان خۆیـان چـی پەسـەند دەکەن و چی ڕەتدەکەنەوە، ئـەوا ئـازادن. ئایـا ئەمـە میتـۆدی زانسـتییانەیە یـان تیرۆرکردنی زانستە؟

## جیٚباسی دووەم:
## چارەنووسی ئیسلام لە خوێندنەوەی ناحەزانیدا

**خواستی یەکەم:** ئیسلام و ئایدیۆلۆژیاکانی مێژوویەتی:

١ – مێژوویەتی لە دیدگای مۆدێرنە و مارکسیزمەوە:

ئەرەگۆن دەڵێ: ئیسلام دەبێتە (شتێکی کۆن و بەسەرچوو و هیچ مانایەکی نییە)، دواتریش دەبێتە هەڵم و با دەیبات[١١٦]. ئەوەی کە دەمێنێتەوە ئەزموونێکی مێژووییە و دەبێ سوودی لێ وەربگرین[١١٧]. هاشم صالح دەڵێ: (پێویست ناکات خەڵکی لە مزگەوتدا کۆمەڵ کۆمەڵ کۆببنەوە بۆ نوێژکردن، چونکە نوێژ لە ئیسلامدا هەروەك ئایینەکانی تر وایە، مەسەلەیەکی تاکەکەسییە)[١١٨]. بەپێی لێکۆڵینەوەی مارکسیزمیش، ئیسلام بەوە وەسف دەکرێ کە بزووتنەوەیەکی موحەممەدییە[١١٩]، یان شۆڕشێکە[١٢٠] بەراورد دەکرێ بە شۆڕشی بەلشەفی یان شۆڕشی فەرەنسی[١٢١]. موحەممەدیش جودا نییە لە جووڵەی واقیع، مرۆڤێکە ئاوات و خۆزگەکانی واقیع و خەونەکانی ئایندە، بەرجەستە بوون لە ناخیدا[١٢٢]. ئەمە کورتەی دیدگای مۆدێرنە و مارکسیزمە بۆ ئیسلام، کە لە نووسینی سەرجەم ئەو ناحەزانەوە بەسەدان گوتەی هاوشێوەی ئەمەی سەرەوە دەبینی، ئیتر هەر بەم سەرپێییە دەڵێن و دەڵێن!!! بەڵام بەرەو کوێ؟ بە یارمەتیی خوای گەورە دواتر بە گشتی وەڵامیان دەدرێتەوە، کە ئایا چارەنووسی ئیسلام لە دەست ئەواندایە

---

[١١٦] قضايا في نقد العقل الديني، أركون، ص٦٠.

[١١٧] هەمان سەرچاوەی پێشوو.

[١١٨] القراءة الجديدة... عبدالرزاق هوماس، ص١٦٩.

[١١٩] النص القرآني، تيزيني، ص١١٣.

[١٢٠] الكتاب والقرآن، محمد شحرور، ص٥٥٥.

[١٢١] تثوير القران، جمال البنا، ص١٠.

[١٢٢] مفهوم النص، أبو زيد، ص٧٤.

یان لە دەست بەدیهێنەری (جلّ جلالـە) سـەراپا مەنزومەیـەکی گەردوونیدایـە، کـە ئیسلامی کردووەتە هەوێنی و یەکێکە لە راگرە سەرەکییەکانی؟

٢– مێژووییەتی و پرۆسەی پچڕپچڕکردنی ئیسلام:

ئەو مێژووییەتییە کە گوتاری عەلمانی دێـت ئیسـلام سـنووردار دەکـات تێیـدا، وەك دەڵێت بەندی کات و شوێنێکی تایبەتە و دەخرێتە ژێر زەمینەی واقیعێکەوە، تا دواجار بڵێت گونجاو نییە بۆ ئەم سەردەمە، ئەوا هەر بەوەوە ناوەستێ، بـەڵکو دێت بە پەرۆشـەوە قسـە لەسـەر چـەند جۆرێـك ئیسـلام دەکـات تـا بـە تـەواوەتی ئیسلام لەتوپەت بکات، بۆئەوەی پرۆسەی پاکتاوکردنی لەبەردەمیـدا ئاسـان بێـت تا بە یەکجاری بیدات بەدەم باوە. هەندێجار ئەرەگۆن ئـەو ئیسـلامە بـە ئیسـلامی ئەرسدۆکسی ناودەبات [١٢٣]، یان بە ئیسلامی کلاسیکیی تەقلیدی [١٢٤]، یـان ئیسـلامی کۆما و تەپۆڵکەیی (أقنوم) [١٢٥]، یان بە ئیسلامی پەناگا، یـان ئیسـلامی جـەماوەری (شعبي) [١٢٦]، یان ئیسلامی تاکەکەسی کە ئەرەگۆن بە ئیسلامی سێیەم ناوی دەبات [١٢٧]، یان ئیسلامی ئەتەنی، بۆ نموونە دەوترێ: ئیسلامی ئەندۆنیسی – پاکسـتانی – عەرەبی یان ئێرانی یان عێراقی یان شامی [١٢٨]، ئیسـلامی سـوننی یـان شـیعی و تـــادوایی. دەوتـــرێ ئیســـلامی ئەشـــعەری یـــان موعتەزیلـــەیی پێشـــکەوتووی پەراوێزخراو [١٢٩].

---

[١٢٣] نافذة على الإسلام، أركون، ص٢٤.

[١٢٤] قضايا في نقد العقل...، أركون، ص١٧٤.

[١٢٥] تأريخية الفكر، أركون، ص١١٥.

[١٢٦] هەمان سەرچاوەی پێشوو، ل١٦٢.

[١٢٧] هەمان سەرچاوەی پێشوو، ل١٦٩، ١٧٤، ١٧٣، ١٧٦.

[١٢٨] قضايا في نقد العقل، أركون، ص٢٣٠.

[١٢٩] النص" السلطة " الحقيقة، أبو زيد، ص١٤.

بــه بۆچــوونی (جــاك بــيرك) ئــەوەی كــە خــوازراو و مەبەســتە، ئیســلامی پێشكەوتووە، چونكە ئیسلامێكی تەمەن درێژ و بەردەوامە[١٣٠]. مـەرجی سـەرەكیی پێشـكەوتن تەسـلیمبوونە، بـەڵام بـۆ خـوای گـەورە نـا، بـەڵكو بـۆ خۆرئـاوای هەژموونداریان بۆ سیستمی نوێی جیهـانی – ئـەمریكی –، واتـە تەسـلیمبوون بـە یەك جەمسەری[١٣١].

**خواستی دووەم:** ئیسلامی عەلمانی نوێ:

ئەو ئیسلامەی كە ئەو نووسەرە بە ئیسلام نەیارانە دەیانەوێت، ئەوەیە كە هیچ مــەرج نییــە ئــەو ئیســلامە نــوێ و هاوچــەرخ و ڕۆشــنگەرە لەســەر پێــنج پایــەی (شــایەتومانی لا إلــه إلا الله محمــد رســول الله، نوێــژكردن، زەكاتــدان، ڕۆژووی ڕەمەزان، حەجی ماڵی خوا) وەستا بێت[١٣٢].

بەشی دووەمی شایەتومانیش بەشێك نییە لە ئیسلام، چونكە پاشـتر خراوەتـە ســەر بــانگ و ئیســلامیش لــە ســەرەتاوە بریتــی بــووە لــە بانگەشــەكردن بــۆ بەیەكگەیشتنی هەموو ئایینەكان[١٣٣].

– نوێژیش مەسەلەیەكی تاكەكەسـی و تایبەتـە[١٣٤] و فـەرز نییـە[١٣٥]، زەكـاتیش فەرز نییە، بەڵكو شتێكی ئارەزوومەندانەیە[١٣٦].

---

[١٣٠] القرآن وعلم القراءة، جاك بيرك، ص١٣١.

[١٣١] هەمان سەرچاوە، ل١٣١.

[١٣٢] من العقيدة الى الثورة، حسن حنفي، ١ / ١٧.

[١٣٣] صوت الناس، الصادق النيهوم، ص٢٥.

[١٣٤] القراءة الجديدة، عبدالرزاق هوماس، ص١٢٩.

[١٣٥] الإسلام بين الرسالة والتأريخ، عبدالمجيد الشرفي، ص٦٣.

[١٣٦] الإسلام بين الرسالة والتأريخ،الشرفي، ص٦٣.

ڕۆژوویش فەرز نییە، بەڵکو ئەرکێکی ئارەزوومەندانەیە[137]. حەجیش یەکێکە لەو نەریتە بتپەرستییە تەقلیدییە عەرەبییە کۆنانە، کە ئیسلام لەبەر خاتری حاڵی عەرەب ئیقراری پێکردووە[138].

راستە کە نیشانەکانی ڕادەستبوون و تەسلیمبوون بە ئیسلام لەوەدا دەردەکەوێ کە مرۆڤ هەستێ بە نوێژکردن و زەکاتدان، ئەم دووانەیش کارێکن قورئان لەوێوە دایناون کە دوو کاری ئایینیی رووتن، بەڵام با ئەوەیش لە بەرچاوماندا ون نەبێت کە لە ڕووی تێکەڵبوونی کۆمەڵایەتی و سیاسیی تاکەکەسەوە، ئەرکێکی یەکلاکەرەوەی گەورە دەبینن. ئەرەگۆن دەڵێ: ڕۆڵێکی گەورەیان هەیە لە شکاندنی ڕەوتە دەمارگیری و هاوکارییە تەقلیدییەکاندا[139]. یەکێکی تریان دەڵێ: ئێمەیش لە ئەمڕۆدا ئەوەمان لێ داوادەکرێ کە پێداچوونەوە بە فەرز و پەرستشەکاندا بکەین و لەبارەی سودەکانی ڕۆژوو و زیانە ئابووری و تەندروستییەکانیەوە پرسیار لە خەڵکانی شارەزا و لە پسپۆڕەکان[140] بکەین.

لەلای تاقمێك لە عەلمانییەکان، باوەڕی هاوچەرخ هەر ئەوەندە بەسە کە لە دوو پایەی باوەڕ بە خوا و بە ڕۆژی دواییدا دەستەبەر ببێت[141]. مەبەستیش ئەوەیە کە جولەکە و گاورەکان بخرێنە نێو چەمکی باوەڕ و ئیسلامەوە، بەوە دابنرێن کە لە ڕزگاربووانی ڕۆژی قیامەتن. ئەم فەرموودەیەی خوای گەورە دەکەنە بەڵگە: (إِنَّ الَّذِينَ آمَنُواْ وَالَّذِينَ هَادُواْ وَالنَّصَارَى وَالصَّابِئِينَ مَنْ آمَنَ بِاللَّهِ وَالْيَوْمِ الآخِرِ) (البقرة: ٦٢)[142].

---

[137] لبنات، عبدالمجيد الشرفي، ص١٧٣.

[138] الاسلام بين الرسالة والتأريخ، الشرفي، ص٦٥.

[139] القرآن من التفسير، أركون، ص١٧.

[140] الاجتهاد في الإسلام، حسين أحمد أمين، ص٢٣.

[141] نحو أصول جديدة للفقه الاسلامي، محمد شحرور، ص٣١.

[142] هەمان سەرچاوەی پێشوو، ل١٢٧.

لای تـاقمێکی تـریش بـوار دەکرێتـەوە بـۆ کۆنفوشیوسـیەت و بـوزی و هـەموو ئایینە دەستکردەکانی تـر، تـا بچنە نێـو کەشـتیی ڕزگارکـەری عەلمانیەتـەوە [١٤٣].

کەی لە حیکمەتی خوایەتیدایە کەسێکی موسڵمان حوکمبدات بەسـەر سـێ لەسـەر چواری خەڵکیدا کە غەیر موسڵمانن و هاوچـەرخی ئـەون، تـابڕۆن بـۆ دۆزەخ، بـەم پێیە ئایا ئەو حەقیقەتەی کە من باوەڕم پێیەتی ڕێژەیی نییە؟! [١٤٤].

یەکتاپەرستی واتە یەکخستنی ئوممەت و هـزر نـەك یـەکتاکردنی خواکـان بێـت (أَجَعَلَ الْآلِهَةَ إِلَهاً وَاحِداً إِنَّ هَذَا لَشَيْءٌ عُجَابٌ) (ص: ٥) [١٤٥].

هەموو نادیارەکانیش، بە گشتی (غیبیات).... [١٤٦]. هەموو کتێبە پیرۆزەکـانیش بە قورئانیشەوە، نکوڵی لە جیهانی غەیب دەکەن. (بەهەشـت و دۆزەخ بـریتین لـە خۆشـگوزەرانی و ئـازاردان لـەم ژیـانی دنیایـەدا، بەهەشـت ئـەو خۆشـگوزەرانی و چـاکەیەیە کـە مـرۆڤ لـەم دنیایـەدا دەسـتی دەکـەوێت، دۆزەخـیش ئـەو خراپـە و سزایەیە کە لە دنیادا توشی مرۆڤ دەبێت) [١٤٧].

وەڵامێك بۆ گاڵتەجاڕیی ئەو ناحەزانە:

لە وەڵامی ئەم پرۆسەی راست و چەپکردن و شەلم کوێرم ناپارێزمەدا، کە ئـەو ناحەزانە بە حەز و ئارەزووی خۆیان دەم لە ئیسلام دەکوتن، ئەویش بە مەبەستی گەیشتن بە مەرامی مامۆستا خۆرهەڵاتناسەکانیان، ئەوا بەو ناحەزانە دەڵێین: ئایـا بەڕاست باوەڕیان لەبارەی ئیسـلام و قورئانـەوە—هـەروەك بینیمـان— وەهایـە کـە تێزە سەرسوڕهێنەر و نامۆکانیان ئەو هەستانەوە و ڕێنیسانس و ئەو پێشکەوتن و گەشـەکردنی ئوممەتـە لەبـەردەم پێشـکەوتنی ژیـار و کـەلتوور و کۆمەڵگاکانیـدا

---

[١٤٣] نافذة على الاسلام، أركون، ص٦٠.

[١٤٤] لبنات، عبدالمجيد الشرفي، ص١٠١.

[١٤٥] حوار المشرق والمغرب، حسن حنفي، ص٥٤.

[١٤٦] النص، السلطة، الحقيقة، أبو زيد، ص١٣٥.

[١٤٧] هەمان سەرچاوەی پێشوو، ٤ / ٦٠١ . ٤ / ٦٠٥.

دەستەبەر دەکات؟ تاکو ئێستا وا پێویست بکات ئیسلام بسڕدرێتەوە یان داپۆشرێ یان بشێوێنرێ؟ یان ئەوەیە کە مرۆڤ خۆی بۆ خۆی پێویستی بە چاکسازی هەیە تا ببێتە وێنایەکی راستەقینە بۆ ئایینی خوای گەورە، تا راستی ئاوێتە و یەکانگیر ببێت لەگەڵ فەرموودەکانی خوای گەورەدا؟ ئایا عەلمانییەکان هەست بەوە ناکەن کە یاری بە ئەقڵەکان دەکەن و گاڵتەبازی بە هزر دەکەن؟ ئەگەر ئەم یاری پێکردن و گاڵتەبازییەش لە لای توێژێك لە خەڵکی یان نەوەیەك لە نەوەکان، رەنگپۆش بکرێ و نەزانرێ، ئەوا هەردەبێ ئەو ساختەکارییە رۆژێ لە رۆژان دەربکەوێت، ئەو فێڵ کردن و تەڵەکەبازییە بکەوێتەڕوو. چ موسڵمانێك دەتوانێ سڕینەوە و ناشیرینکردنی ئیسلامی بە ناوی ئیسلامەوە لاپەسەند بێت، بەڵکو چ ئاقڵێك هەیە تەنانەت با موسڵمانیش نەبێت، دەتوانێت ئەو تێگەیشتنانەی کە دەخرێنەڕوو و ئەو هزرانەی کە دەخرێنە بەرچاو و دەلکێنرێن بە ئیسلامەوە و پشت بە دەقەکانی ئیسلام دەبەستن، قەناعەتیان پێبهێنێت؟ ئیسلام بە سروشت و بە پێکهاتەی خۆی، گاڵتەبازی هەڵناگرێ. خۆرهەڵاتناسەکانیش ئەم حەقیقەتەیان تێبینی کردووە، چونکە هەروەك پێغەمبەر (ﷺ) دەفەرموێ: (ئیسلام راستییەکی روون و درەوشاوەیە، شەوی وەك رۆژی رۆشنە، رۆشنە و هیچ لێڵییەکی تێدا نییە، ئاسانە و ناڕەحەتیی تێدا نییە، فراوانە و تەنگەبەریی تێدا نییە)، ئەمەیش نهێنیی هێزیەتی، نهێنیی نەمرییەتی، ئەمە نهێنیی بەجیهانبوون و گشتگیرییەکەیەتی، هۆکاری بڵاوبوونەوەیەتی کە خەڵکی بە پەرۆشەوە بەپیریەوە دێن.

هەوڵدان بۆ بە ناڕەوا تەئویلکردنی ئیسلام و دەستکاریکردن و گۆڕینی، کات بە فیڕۆدانە و بێسوودە، چاك وایە کە ڕوو بکەینە کاری چاکە و بونیادی بەرهەمهێنەر، چونکە ئەم ئوممەتەمان پێویستی بە ڕووخاندن نییە، شتێکمان نییە بڕووخێنرێ، بەڵکو چەندین رێسا و بناغەی پتەو و پێگەی ڕیشە داکوتاو و قەڵای سەرسەختمان هەیە، پێویستی بە وەستا و بیناسازی هەیە، بە ئامێر و

ئـامراز و هێـزی کارگـەر هەیـە، زیـاتر لـەوە کـە پێویسـتی بـە پـلان و پـرۆژە و ئەندازیارەکان هەبێت.

چەندین سەدەیە نەهامەتی و مەینەتییەکانی ئەم ئوممەتە لە دەقەکانـدا نییـە، بەڵکو لە دزەکاندایە، لەو فەمانڕەوایانەدایە کە بوونەتە بەربەست و ڕێگر لەبەردەم هـەر پێشـکەوتنێك و هەسـتانەوەیەکی ئـەم ئوممەتـەدا، چـونکە ئـەو پێشـکەوتنە فێرعەونیەتییەکەیان لە دەست دەدات، تەنها بیر لە کورسی و تەختەکەی خۆیان و جێنشـینەکەیان دەکەنـەوە. کەسـێکیان نییـە بیربکاتـەوە لـە ئامـادەکردنی هۆکارەکانی ژیانێکی ڕێزدار بـۆ خـەڵکی، کەسـێك نییـە بیربکاتـەوە لـە پاراسـتن و پاسەوانیکردنی دادپەروەری و ئاسـایش و حـەق و ڕاسـتی. لێـرەوە دەڵـێین ئێمـە پێویستمان بەو پرۆژە عەلمانییانە نییـە کـە ئیسـلام دەسـڕنەوە، چـونکە ئیسـلام ئاسـتەنگ نییـە لەبـەردەم پێشـکەوتندا، ئێمـە پێویسـتمان بـە شۆڕشـێکی ڕاسـتەقینەیە کـە ئیسـلام بگێڕێتـەوە بـۆ بارەگـای سـەرکردایەتی و پێشـڕەوی و کاریگەریی، لە ڕێگایدا هەموو دز و فیرعەونەکان ڕامالێ بۆئەوەی ڕۆڵی خۆی ببینێ لە پێشکەوتن و گەشـەکردنی ئـەم ئوممەتـە و ژیارەکەیـدا، هـەروەك چـۆن پێشـتر ئەمەی کردووە و بۆیشی چووەتە سەر.

# کۆتایی:

لە پاش ئەم خوێندنەوەیە، دەتوانین ئامـاژە بـدەین بـەم دەرئەنجامانـەی لای خوارەوە:

١- خوای گەورە ئەقڵی دروسـتکردووە و ئامرازەکـانی پـێ بەخشـیوە، ئەگـەر خـۆی دامـاڵێ لـە حـەز و ئارەزوەکـان و مەبەسـتە تایبەتـەکانی دەروون، ئـەوا لەتوانایدایە ڕێگای ڕاست بگرێتە بەر و بگاتە ڕاستی. خوای گەورەیش سـنوری بـۆ دیاری کردووە کە نابێ جیهانی بینراو و هەستپێکراو تێپەڕێنێ.

٢- کاتێکیش کە ئەقڵ لە گومان و لە نازانمدا کۆتایی دێت و حەزە خۆڕسك و سـەرزەوییەکان زاڵ دەبـن بەسـەریدا، ئـەوا دەبێتـە دڕندەیـەکی سـەرکێش و هـیچ شتێك نییە بتوانێ بەری پێبگرێت.

٣- دەبوایە ئەم ئەزموونـە خۆرئاواییـە ببوایـە بـە پەنـدێك بـۆ ئێمـە، چـونکە کۆمەڵە مەسـەلەیەك هـەن ئـەقڵ لـە توانایـدا نییـە بچێتە ناویـان، لەوانـە جیهـانی غەیب، وەك ڕۆژی دوایی و زاتی پەروەردگار و سیفەتەکانی.

٤- بـۆ گەیانـدنی ئـەم مێژووییەتـە، هـاتن ئـەو ڕێگایانـەیان گرتەبـەر کـە موسـڵمانان پێیـان خۆشـە، ئـەو چـەمکە ئیسـلامییانەیان بـەکارهێناوە کـە خـاڵی کراونەتەوە لە ناوەڕۆکی ڕاستێتیی خۆیان وەك مەبەستەکان و زانستەکانی قورئان و لێکدانەوەی مانا و گۆڕینی (تأويل).

٥- ئەم حاڵەتە ڕەنگیدایەوە لەسەر ئەو مەرجەعیەتە کە دەبێ حـوکمی ژیـان بکاتە مەرجەع، فەرمانڕەوا بوو بە مرۆڤ و واقیع.

٦- جا لەبەرئەوە کە قورئان لە هزری عەلمانیەتدا مانایەکی بـۆ نەماوەتـەوە، ئەوا ئەو پیرۆزییەی لەدەست داوە کە موسڵمانان هەیانە بـۆی، بووەتـە مایـەی ڕق لێبوونەوە و لێ ڕاکردن.

٧- جا بۆئەوەی نووسەرە ناحەز و عەلمانییەکانی لای ئێمە زیاتر بـەوەفا بـن بۆ ڕیشکە خۆرئاوابیە دنیا گەراییەکـەی عەلمانیـەت، ئـەوا هـەموو ئـەو گوتانـەیان

جوویوەتـەوە کـە خۆرهەڵاتناسـەکان لـە وێنـەی (فنـدر) لـە کتێبەکەیـدا بـە نـاوی (تەرازووی ڕاستی)، نووسیویەتی و خۆرهەڵاتناسانی تری وەك (نۆڵدکە و بلابشـیر) دەبارەی مێژووی قورئان و کۆکردنەوە و نووسینەوەی، گوتویانە.

بۆیـە پێویسـتە بـە چـەند راسـپاردەیەك کۆتـایی بـەم بابەتـە بهێـنین: ئـەرکی سەرشانی ئێمەی موسڵمان ئەوەیە کە بـە هـەمان چـەکی ئـەو گوتـارە خـۆی، لـەو ناحەزانە بدەین. نابێت بە تەنها ناڕەزایی دەبـبڕین و بـە ڕەتکردنـەوە و بـە گـەوج زانینی ئەو گوتارە دەست کۆتا ببین، چونکە ئەگەر ئەم کارانە بەڵگەی سـەلمێنەر نەبێتە یاوەریان، ئەوا زیانیان لە سوودیان زۆرترە. دەبێت سەرچـاوە و مەرجەعـە عەلمانییـەکان بخوێنینـەوە و ئاگـادار بـبین لـە نـوێترین شـتێکیان کـە خۆیـان هەڵدەکێشن پێیەوە. زانایـانی پێشـوو بـە کـەم سـەیری هـزرە هاوردەکراوەکـان و فەلسـەفە داگیرکارەکانیـان نـەکردووە، بـەڵکو تێکـەڵاوی بـوون و جـوان لێـی شارەزابوون، بە ئاستێکی وەها زیاتر لە خەڵکەکەی خـۆی، خسـتونیانەتە ئاسـتی هاوەڵانی خۆیان و دواتر وەك پاڵەوان چوونەتە مەیدانیان، هەر ئەوەندە بـووە کـە چـەند سـاڵێکی کـەم تێپـەڕیوە، ئـیتر تـەواوی ئـەو زانسـتە جۆراوجۆرانـەیان هەرسـکردووە و دواتـر سـەرلەنوێ بینایـان کردونەتـەوە بـە جـۆرێ کـە گونجـاوبن لەگەڵ پرەنسیپەکانی ئیسلام و بەها باڵاکانیدا.

ڕاسـپاردەی دووەممـان ئەوەیـە ئێمـە وا دەبیـنین کـە توێژینـەوە ئەکادیمییـە فەلسـەفییەکان، لـە بەشـەکانی خوێندنـە ئیسـلامییەکاندا، گرنگـی دەدەن بـە خوێندنی کەلەپوور زیاتر لە گرنگی پێدانی خوێنـدنی واقیعـی هاوچـەرخ، ئەمـەیش وایکردووە کە گۆڕەپانەکە بەجێبهێڵرێ بۆ گوتاری عەلمانی، تا کەلێنەکە دابخات و بۆشـاییەکە پـڕ بکاتـەوە. ئـەم کـارەیش لەسـەر ئاسـتی هـزر و زانسـت و واقیـع، ڕەنگدانەوەی مەترسیداری لێ پەیدا بوو، بە تایبەتی لە ڕاکێشـانی ژمارەیـەکی زۆر لەو نیوە ڕۆشنبیرانەی کە بەهۆی پشت نەبەستنیان بە ڕێسایەکی ئوسوڵیی قایم و پتەو، میتۆدەکان هەڵیان دەخەڵەتێنن. بۆیە داوا دەکەین لـەو هەڵسـوڕێنەرانە کـە

ڕێنمایی خوێندنە ئەکادیمییەکان دەکەن، تا هاوسەنگییەك دروست بکەن لە نێوان واقیع و ڕابردوودا، ئەوەی کە بانگەوازی بۆ دەکەین ئەوەیە کە لە نێو واقیع و هەنووکەوە هەنگاو هەڵبگرین بۆ ڕابردوو، بەڵام بەداخەوە ئەوەی کە ڕوودەدات ئەوەیە کە خوێندنە ئیسلامییەکان تەنانەت لە ڕابردوویشەوە هەنگاو هەڵناگرن بۆ ئێستا، بەڵکو هەر لە بەندی ڕابردوودا ماونەتەوە و هیچ پەیوەندییەکیان دروست نەکردووە لەگەڵ ئێستا و واقیعی هاوچەرخدا، تا وامان لێهاتووە نامۆ ببین بەم چەرخەمان. بواریش بڕەخسێنین تا غەیری ئێمە زیاتر تەبا و گونجاو و خۆشەویست بێت لەگەڵیدا — دواجاریش ئەوی لەلا پەسەند بێت.

ئەو پرۆژە عەلمانییانەی کە بە ناوی واقیع و مرۆڤ و بەرژەوەندی و مەبەست و ئامانجەوە خۆیان دەخەنەڕوو، دەتوانرێ بە ئەلتەرناتیڤی ئیسلامی ڕووبەڕوویان ببینەوە، خراپ و دەغەڵەکەی ڕەتبکرێتەوەو سود وەربگیرێ لەوەی کە چاك و بەکەڵکە. ئیسلام ئاستەنگ نییە لەبەردەم واقیع یان گەشەکردندا، ئەمەیش ئەو مانایەیە کە خوای گەورە دەفەرموێ: (وَمَا جَعَلَ عَلَيْكُمْ فِي الدِّينِ مِنْ حَرَجٍ) (الحج: ٧٨).

لەڕاستیدا گوتاری عەلمانی دەیەوێت ئەو پەرژینە — کە لە دیدی ئەوەوە دۆگمایە — بڕووخێنێ، تا خۆی بخزێنێتە نێو غەیبەوە، هەر دەیەوێت ئەو پەرژینە بشکێنێ و بچێتە ئەودیوی سنوورە قەدەغەکراوەکان. لەم بوارەدا هەموو ئەزموونە مرۆڤایەتییە دوورودرێژە شکستخواردووە هاوشێوەکانی پێش خۆی پشتگوێ دەخات. ئەرکی ئێمەی موسڵمانیش ئەوە نییە کە پاڵی پێوە بنێین بەرەو لەناوچوون و کەوتنە خوارەوە، بەڵکو دەرهێنانیەتی لەو چاڵە سەرنگومکەرە، ئەویش بە هەمان شێوە بێت کە پێغەمبەرەکەمان فێری کردووین. ئەو پێغەمبەرەی (ﷺ) کە ڕەحمەتێکە و نێردراوە بۆ هەردوو جیهان.

**وآخر دعوانا أن الحمدالله ربّ العالمين.**

# سەرچاوەكان:

١- العلمانيون و القرآن الكريم، د. أحمد إدريس الطّعان.

٢- الماركسلامية والقرآن الكريم، المحامي محمد صيّاح المعرّاوي.

٣- الفكر الاسلامي قراءة علمية، د. محمد أركون.

٤- سقوط الغلو العلماني، د. محمد عمارة.

٥- دراسات إسلامية، د. حسن حنفي.

٦- الاتقان في علوم القران، السيوطى.

٧- الكتاب و القرآن، المهندس محمد شحرور.

بۆ پاراستنی ئەمانەتی زانستی، دەڵێم: سەرچاوەی سەرەكیی ئەم بابەتە، سەرچاوەی یەكەمیانە بە پەراوێزەكانیشەوە.

# پەیمانگای جیهانیی فیکری ئیسلامیی

دامەزراوەیەکی فیکریی ئیسلامیی رۆشنبیریی سەربەخۆیە، لە سەرەتای سەدەی پانزەیەمی کۆچی (١٤٠١ك ـ ١٩٨١ز) لە ویلایەتە یەکگرتووەکانی ئەمریکا دامەزراوە، تا کار بۆ ئەم خالانەی خوارەوە بکات:

– فەراهەمهێنانی تێڕوانینی گشتگیرانەی ئیسلام، لەپێناو تەئسیلکردنی مەسەلە هەنووکەییەکانی ئیسلام و روونکردنەوەیان، هەروەها لەپێناو پێکەوەگرێدانی بەش و لقەکان بە هەمەکییەکان (الکلیات) و مەبەست و ئامانجە گشتییەکانی ئیسلام.

– گێڕانەوەی ناسنامەی فیکریی و رۆشنبیریی و ژیاریی بۆ ئوممەی ئیسلامیی، ئەویش لە میانەی چەند هەوڵ و کۆششێکی بەئیسلامکردنی زانستە مرۆڤایەتیی و کۆمەڵایەتییەکان و چارەسەرکردنی مەسەلەکانی فیکری ئیسلامیی.

– چاکسازی لە پرۆگرامەکانی فیکری ئیسلامیی هاوچەرخدا، بۆ ئەوەی ئوممەی ئیسلامیی توانای دووبارە گەڕاندنەوەی شێوە ژیانە ئیسلامییەکەی خۆی و هەروەها رۆڵی خۆی لە ئاڕاستەکردنی کاروانی ژیاریی مرۆڤایەتی و بەرچاوڕۆشنکردنی و گرێدانی بە بەها و ئامانجەکانی ئیسلامەوە، هەبێت.

پەیمانگا، بۆ بەدەستهێنانی ئامانجەکانی چەند هۆکارێك دەگرێتەبەر لەوانەش:

– بەستنی کۆنگرە و سیمیناری زانستی.

- هاوكــاریی هــەوڵ و كۆششـــی زانــا توێــژەرەوەكانی زانكــۆ و بنكــەكانی توێژینەوەی زانستیی و بڵاوكردنەوەی بەرهەمە زانستییە نایابەكان.

- ئاڕاستەكردنی توێژینەوە زانستی و ئەكادیمییەكان لـەپێناو خزمـەتكردن بـە فیكر و مەعریفە.

هــەروەها پــەیمانگا چــەند نووســینگە و لقێكــی لــە پایتــەختی وڵاتــە عــەرەبی و ئیســلامییەكان و وڵاتــانی تــریش هەیــە، كــە لــە ڕێگەیانــەوە كــار و چــالاكییە جۆراوجۆرەكانی خۆی ئـەنجام دەدات، هـەروەها چـەند ڕێكەوتننامەیـەكی لەگـەڵ ژمارەیەك زانكۆی عەرەبی و ئیسلامیی و خۆرئـاوایی لـە سەرانســەری جیهانـدا بـۆ هاوكاریی زانستی هاوبەش، هەیە.

# سەنتەری زەهاوی بۆ لێکۆڵینەوەی فیکریی

سەنتەرێکی کوردستانی ناحکومی ناسیاسییە، گرنگیی دەدات بە توێژینـەوە و تاوتوێکردنی پرسە هزرییە بنەڕەتییەکان بۆ دووبـارە هێنانـەگۆی دەق و تێکسـتە پیرۆزەکان و چۆنیەتی دابەزانـدنی چـەمکە مـەعریفی و بەبایەخـەکانی ئیسـلام لـە بوارە جیاوازەکانی سـەردەمدا، لـە سـۆنگەی ئـەوەوە کـە هـزر و بـیری ڕەسـەن و قووڵ بنچـینەی تێگەیشـتنی ڕاسـت و دروسـتە بـۆ دەقـەکانی قورئـان سـوننەت و دەستەبەری لێکدانەوەی گونجاوە بۆیان، سەنتەر هەوڵی ڕەخساندنی کەشوهەوای گونجاو دەدات بۆ کارابوونی عەقڵ و بـیر و ڕانـانی هزریـی، لـەم پێنـاوەدا سـەنتەر هەردوو سەرچاوەی قورئانی پـیرۆز و فـەرموودەی بـەرز و بـەڕێز بـە بـەکارهێنانی ئـامرازی زانسـتە ئیسـلامییەکان و زانسـتە کۆمەڵایـەتی و سروشـتییەکان دەکاتـە بنەمای کارەکانی.

**ئامانجەکانی سەنتەر:**

ــ بوژاندنــەوەی بـیرو هـزر و بەکارخسـتنی مەعریفـەی ئیسـلامی لـە ناوەنـدە زانکـۆیی و پەروەردەییەکانـدا، بـە پشتبەسـتن بـە بـەهرە و توانـا خودییــەکانی ئەکادیمیانی کوردستان و جیهانی ئیسلامی و ئەزموونی بیرمەندانی مسوڵمان.

ـ پەرەپێدان و پەسەندکردنی ڕوانگەی زانستی مەنهەجی لە چارەسەرکردنی کێشە و گرفتە هزرییەکاندا و بێلایەنبوون لە پرسە خیلافییەکاندا و خۆبەدوورگرتن لە بڕیاری پێشوەخت و شێوازی سۆزدارانە و هەوڵدان بۆ بابەتیبوون.

ـ کاراکردنی کەلەپووری دەوڵەمەندی ئیسلامی و سوودوەرگرتن لە سەرچاوە گرنگەکانی بیری ئیسلامی لە کۆن و نوێدا و سەرلەنوێ هێنانەگۆی چەمکە فیکرییە دوێنراوەکان لە مێژووی ئیسلامیدا، بە ڕەچاوکردنی گۆڕانەکانی سەردەم.

ـ پەرەپێدانی چەمکی ئیعتیدال لە کایە فیکری و مەعریفییە جیاوازەکاندا و خۆبەدوورگرتن لە تێپەڕاندن و بەزایەدان.

ـ سەنتەر کاردەکات بۆ سەرلەنوێ و بەردەوام خوێندنەوەی هەردوو پەڕاوی قورئان و بوونەوەر بەپێی مەنهەج و میتۆدی زانستی و بەبێ چاولێکەری، بەڵکو بە نەفەسێکی تازە و بە سوودوەرگرتن لە عەقڵی ڕاشکاو و نەقڵی سەلمێنراو.

**بوارەکانی کارکردن:**

ـ نووسین بە قەڵەمی خۆماڵی نووسەرانی کورد و بیرمەندان.

ـ وەرگێڕان لە زمانە جیاوازەکان بۆ زمانی کوردی لە پێناو دەوڵەمەندکردنی کلتووری کوردی.

ـ بەستنی کۆڕ و سازدانی سیمینار لەلایەن خاوەن بیر و ئەکادیمیانەوە.

ـ خولی ڕاهێنان و وۆرکشۆپ لەلایەن کەسانی پسپۆڕ و خاوەن بڕوانامەی زانکۆییەوە.

ـ هاوکاریکردنی دامودەزگا و دامەزراوە ئەکادیمییەکان و زانکۆکان لە پێناو پەرەپێدانی ئاستی زانستی.